# ئازاد دارتاش

# دەنگ و هەڵنگفتن



خوێندنێن رەخنەیی



## ❖ئازاد دارتاش

- ئازاد مەجید عەبدوللا
- ژ دایکبوویێ باژێرێ ئاکرێ یە.
- دەرچوویێ زانکوا تەکنەلۆجیە لە بەغدا
- ئێک ژ دامەزرێنەرێن بزاڤا رۆشنبیری ل ئاکرێ
- ژ دامەزرێنەرێن گروپی نویخوازە ل ئاکرێ
- ئەندامێ ئێکەتی یا نڤیسکارێن کوردە تایێ دهۆک
- ئەندامێ سەندیکا رۆژنامەڤانێ کوردستانێ و جیهانێ یە
- سەرنڤیسکارێ کۆڤارا ( بیاڤ ) یا هزری ـ رەخنەیی
- ب دەهان گوتار و ڤەکولینێن ئەدەبی ـ هزری ـ رەخنەیی و ستونێن رۆژنامەڤانی د کۆڤار و رۆژنامەیێن و سایتێن کوردی و عەرەبی دا بەلاڤ کرینە.
- پشکداری د کومەکا سمینار و ڤیستڤال و مێزگردێن ئەدەبی و هزری دا کریە
- کتێبەکا دی بناڤێ ( پابەند بوون و ئەوێ دی) کەهاندیە چاپێ
- نها رێڤەبەرێ پەیوەندیێن گشتیە ل وەزارەتا رۆشنبیری هەرێما کوردستانێ



ژ وەشانێن ئێکەتیا نڤیسەرێن کورد . تایێ دهۆکێ
تسلسل ٦٦

ناوی کتێب: دەنگ و هلنگفتن

ناوی نووسەر: ئازاد دارتاش

بابەت: خوێندنێن رەخنەیی

بەرگ و دیزاینی ناوەوە: ئاگری بالەکی

تیراژ: ١٠٠٠ دانە

چاپ: یەکەم – ٢٠٠٩/ هەولێر

چاپخانە : هیڤی ـ هەولێر

ژمارەی سپاردن: ٢٠٦٢

# جوانی دهوندر تێکستا
# ئەدەبی دا گەش دبیت

ئەگەر ئەرکێ ئێکێ یێ فەیلەسوفی ئەو بیت، کو تەماشەی کەتواری بکەت و دیاردەیەکێ یان کۆمەکا دیاردەیێن ب هەڤڕا گرێدایی ڤەخوینیت و ب ئامراز و تیور و پەیڕەو و رێچکە و ئاوێزێن خۆ راڤە و شروڤە بکەت ژبۆی کو بگەهیتە راستیان, کو ئەو راستی ژی بخۆ هەلگرێن هنەك یان رێژەکا درەوانە، لێ فەیلەسوف وان درەوان پاشگوه دهاڤێژیت و لسەر لوژیکەك رەها تەڤ دەرئەنجامان وەکو راستی ل قەلەم ددەت, لێ دبینم کو ئەرکێ هەلبەستڤانی قورستر دبیت و ژبلی ئەرکێ مێژەکرن و خویندنا کەتواری، هەلبەستاڤان یێ داخواز کری یە کو یادگار و ئەزموونا خۆ وەکو تاکە کەس کو ئەندامێ کۆمەکا جڤاکی یا دەستنیشانکری یە, و ب ئاوایەك هونەری و ستێتیکی بۆ ئەوێن دی، یان بۆ مە وەکو وەرگێڕ

و خویندەڤان ڤەگوهێزیت، یان ب گوتنەك دی، ب یاری یەکا زمانەڤانی وی کەرستەی ئەویَ دبەردەستێن وی دا بکەتە کەڤالەکیَ هونەری و د هشیَ مە دا جهگیر و بەرجەستە بکەت کو ددەمەکی دا ئەو دەربڕینیَ ژ ناخ و هەست و نەستێن خۆ دکەت، دهەمان دەمدا دزانیت کو ئەو بیَ ب زمانەك هەلبەستکی ب ڤی کاری رادبیت چونکی راستە ئەو بیَ ب شروڤەکرنا ئاسوَ و رەهەندێن مژاریَ رادبیت، لیَ ب زمانەك جودا ژ تەڤ ژانرێن دی یێن ئەدەبی و ستایلێن دی یێن نڤیسینیَ، و ئاشوپ و دورهێلی تەڤلی هەڤ دکەت. ئەو تێکستا هەلبەستکی یا سەرکەفتی یە ئەوا شیای بەریا هەرتشتەکی خۆ ژ زمانیَ ڤەگێڕانیَ دویر بکەت و ب دیتنەکا ئەبستراکت و ستێتیکی ویَ مژار و دۆزا ل جەم وی هەی وەکو هەلبەستڤان، یان ئەو مژار و بیرۆکا د هشیَ وی دا ئارپای و دخوازیت ل دۆر ب پەیڤیت بکاریت ب جەڤەنگ و هێما و رستەیێن هەلبەستکی پتر ب ئارینیت و مژاریَ ب تەڤایا پێکهات و کەرستێن وێڤە، بەر ب سەنتەك دی ب بەت و وەها ل پێکهاتا هان بکەت کو رندتر ب بیت و دبەر چاڤ و هشیَ مەدا دلڤینەك دۆمدار دا بیت، هەتا ئەو تشتێن بیَ روح و نەلڤ و ستاتیك شیانا بزاڤتنیَ بدەتیَ، هەتا ویَ راددیَ هەر ئێك ژوانا ب پەیڤن و بۆ مە وەکو وەرگێڕ سەربۆر و سەرهاتیێن خۆ ڤەگێڕن , و بکاریت ویَ جیهانیَ بکەتە کەرەستەك هەستپێکری کو مرۆڤ هەست بکەت دیَ کاریت کەرەستێن هان ب چاڤان ب بینیت و ب دەستان بگریت و بگوهان ب بهیسیت ..هتد. لڤێریَ ژی بەرفرەهیا جیهانبینی یا هەلبەستڤانی رۆلەك گرنگ دلەیزیت.

خالەك دی هەیە دەقا هەلبەستێ ژ دەقێن دی جودا دکەت یان ب گشتی هەلبەستێ ژ ژانرێن دی یێن ئەدەبی جودا دکەت، ئەوە کو گەرەکە تێکستا هەلبەستێ وەرگری بەر ب جیهانەك بێ سنوور و ڤەکری هەتا دویماهیکێ ب بەت.. هەست بکەت وێنەیێن هەلبەستێ وی بەر ب جیهانەك دی دبەت، هەروەها گەرەکە رستەیێن هەلبەستێ هەردەم خویندەڤانی تویشی ڤەجنقینێ بکەت کو ژێرا دبێژن "ڤەجنقینا وەرگرتنێ"، و ئەڤ چەندە ژی دروست دبیت دەما درستەیێ دا خویندەڤان یان وەرگر سەرهەلی تشتەکێ چاڤەرێ نەکری بیت. بۆ نموونە رستەیا **(خوینێ ب دەستێن من سور نەکەن)** یا هەلبەستڤان ا محسن قوچان، دبینین کو تێدا دیروکەك دویر و درێژ خەست بوویە و خویندەڤانی هەڤرویشی ڤەجنقینێ دکەت, چونکە ئەم لسەر وێ گوتنێ راهاتینە ئەوا دبێژیت:(دەستێن من ب خوینێ سور نەکەن) کو رامانا وێ چەندێ ددەت کو من نەڤێت ئەز کەسەکی بکوژم یان بەشداریێ دکوشتنا خەلکەکی دا بکەم, یان دەست نەفرەتا خۆ ژ خوینێ و کوشتن و وێرانکرنێ دکەت و رەنگێ سور دڤێ رستەیا دووێ دا هەلگرا رامانێن وێرانکارە و دەست رامانا پاکژی و دلپاکیێ ددەت، لێ هەلبەستڤان قوچان هات و ب شەهرەزایی ڤە ب رستە و پەیڤان یاری ب لێراهاتنا مێشکێ مە کر و جهێن پەیڤان لێك گوهورین داکو رامان و ئامارژەیەك نوی ژمەرا بینیت. **(خوینێ ب دەستێن من سور نەکەن)** وەها ڤێ رستەیێ ڤەدخوینم کو دەستێن مە هند مەرگدوست و کوژەکن و خوینێ رەنگ و دەلالەتێن خۆ ژ دەست داینە و ئەگەر هەڤبەری دەستێن

خۆ بکەین دێ بینین کو رەنگێ دەستێن مە ژبەر کریارێن مە یێن هۆڤانە ژ خوینێ سورترن. وەها ژی ژبلی چێژ وەرگرتنێ وەرگر دێ کاریت تێڕامانەك کویر دئاڤاهیێن وێ دا بکەت، ب تەڤایی گەرەکە هەلبەست وەها ل وەرگری بکەت کو هەست بکەت ئەو جیهانا دی ئەوا هەلبەستڤانی دڤێ وی دا بەرجەستەکری، بۆ وی جیهانەك نامۆیە و نامۆ نینە دهەمان دەمدا، ب چەند پەیڤێن دی، ئەڤ حالەتە بیاڤەکی دروست دکەت کو دبێژنێ بیاڤێ تنگژینێ. وەرگر، لڤێرە مەبەستامە وەرگرێ پوزەتیڤ و ئەرێنی یە، هەست بکەت نەمازە دخویندنا پشتی خوندنا ئێکان دا ، ئەو جیهان دناخێ وی دا هەیە ، دنێڤ کویراتیا کەسێ وی دا هەیە، دڤێ وی یێ ڤەشارتی دا بو .. هەلبەستڤان شیا ئەوێ جیهانا ڤەشارتی و نخافتی ب ئەفراندنەکێ سەرئاڤ و زەلال بکەت. هەلبەت لڤێرێ سەنگی یا زمانێ هەلبەستێ خویا دبیت، هەلبەست ئەو ژانرێ ئەدەبی ئەوێ شیای تەڤ ژانرێن دی یێن ئەدەبی ب هێز و دەولەمەند بکەت، پرسیار ئەوە ئەو چ ژانرێ نڤیسینێ یە مفا ژ هەلبەستێ و زمان و ئەزموونا هەلبەستێ وەرنەگرت بیت؟ ئەگەر ئەو گوتن ئەوا دبێژیت: (**تنها سەردەمێ مرنا هەلبەستێ یە** ) یا راست بیت، لڤێرێ پرسیارەك دروست دبیت، ئەو چ ژانرێ دی یێ نڤیسینێ یە کو بکاریت ئەو جهێ هەلبەست ب نەمانا خۆ ڤالا دکەت ، و ئەو ڤارێبوون و یاخیگەری و یاریبازی و نامۆیی و خۆشی و چێژ ، ئەوێن ب زمانێ هەلبەستێ بەرجەستە دبن، دشیانێن وێ دا بن کو ل هەمبەر ڤان وەرچەرخان و گوهارتنا هەمبێزدار و درێژپێدەر بیت ، بکاریت دنێڤبەرا پەیڤ یانکویان دا

بیاڤەکی پەیدا بکەت کو دویێ بیاڤێ دا هەروهەر پەیڤ ژ رامانێن خۆ بێن فەرهەنگی و کەهی و دووبارەکری یاخی و هاڤی ب بیت، پەیڤ و هێمایێن هەلبەستێ چ جاران دنێك بازن دا نەزڤڕیت، بەلکو د نویژەنکرنەك دۆمدار دا بژین، هەلبەست و زمانێ هەلبەستێ شیان ب درێژەهییا دیروکا هەر زمانەکی تێنەك نویگەه بدەنێ و کلتور و فەرهەنگێ ژ مەندی و گەنیبوونێ قورتال بکەن.. پەیڤان ب چەندین رامان و واتەیێن سەردەمیانە دەولەمەند بکەن.. ئەگەر ئەم تەماشەی رۆمانێ بکەین وەکو زمانێ بازنڕی دبینین، ئەو رۆمان یا سەرکەفتی و خودی پایەیەك بلندە ئەوا تژی رستەیێن هەلبەستکی و ئەگەر ئەڤرۆ هندەك زمان گەهاینە لوتکا پێشکەفتنا خۆ ، ئەو زمانن ئەوێن زۆر کارێ گران و قورس لسەر هاتیە کرن مینا زمانێ ئنگلیزی و فەرەنسی و ئەسپانی..هتد، ئەگەر ئەو گوتنا سەری یا راست و دەم سەردەمێ مرنا هەلبەستێ بیت، بۆ زمانەك مینا زمانێ کوردی، گوتنا هەنێ گوتنەك لاسایی و چاڤلێکەرە ،کو بۆ دەمێ سەدەها سالایە ل ژێر داگیرکرنێ دایە و زمانەك قەدەغە بوویە و بتنێ ل وارێ شعرێ دا کارەك لسەر هاتیە کرن و ڤی زمانی پێتڤی ب دەهان سالێن ئازادیێ یە، دڤێت کارەك رژد و خەمخۆر لسەر بێتەکرن هەتا بگەهیتە لوتکەیا خۆ.. ڤێجا ئەگەر ل وی دەمی ئەڤ پرسە دروست ب بیت، چێ دبیت ب بیتە جهێ گەنگەشە و دانو ستاندنێ, لێ ئەڤرۆ ئەڤ پرسیارە پرسیارەك کیڤی و نامۆ یە، نەمازە بۆ زمانێ کوردی هەر پرسیارەك زوی و هێژ نە دەمێ ویێ یە.. زمانێن دی ئەڤە بۆ دەمێ سەدەها سالایە د ئەکادیمی و زانینگەه و مەلبەندێن زانستی دا کارەك

پروگرامهەمبێز لسەر هاتیە کرن، بەروڤاژی، زمانێ کوردی کارەك وەها لسەر نەهاتیەکرن و ئەو دەرفەت بۆ دروست نەبوویە کو د وی چارچویڤێ پێدڤی دا وەرارێ بخۆڤە ب بینیت، بتنێ ئەڤە ١٥ سالە کو ئەم دکارین بێژین مە زانینگەهێن کوردی هەنە و مە کەسانێن کورد هەنە ب رێڤە دبەن ، لێ نها ژی ئەم نکارین بێژین کو ب عەقلەك کوردی تێنە ب رێڤەبرن، چونکو هەتا نها عەقلێ مە تەڤان لژێر فشارا گوتارا داگیرکەرانە. ئەگەر زمانێ کوردی وەرارەك ژی بخۆڤە دیتبیت د چارچویڤێ هەلبەستێ دا بوویە، بۆ ئێکەمین جار تێکستەك هاتبیتە نڤیسین ، ب دید و عەقلەك کوردی و ب پەیڤێن کوردی و ژلایێ نڤیسکارەك کوردڤە، شعر بوویە ، هەر ژ بابا تاهرێ هەمەدانی و جزیری و نالی و خانی .. هەتا ئەڤرۆ ژی ل پەی دیتنا مە، شعرە دکاریت هەمبێزا ئەڤان مەرجێن هەنێ بکەت، چونکو شعرە بتنێ دشێت رەتکرنەڤا تەڤ قالب و شێواز و فۆرمێن چارچویڤەکری و سنووردایی بکەت، ئەگەر مەموزینا خانی ، وەکو نموونە وەربگرین، دبینین کو رەهەندێن دیروکی و سیاسی و هزری و سوسیولوژی و ئاشوپ و ئەفسانە و فەلسەفە و حیکمەت تێدا هەنە و دویێ داستانێ دا بۆ جارێن ئێکان بوویە عەقلێ کوردی لڤینەکا رابوونگەرانە هەمبێز بکەت و دکارم بێژم ئەو لڤین مینا ڤیژی و گازیەکا نەتەوی بوویە دناخێ مرۆڤەکێ کورد دا هەلقیایە و دەرکەفتی یە دا کو ژمەرا بێژیت : ئیرۆ سەردەمێ هشیاربوونێ یە د هەموو بواران دا.

ل وی دەمی مرۆڤ دکاریت بێژیت کو سەردەمێ شعرێ نەما دەما هەر تشتەك(دیروك –فەلسەفە–کلتور–هونەر–چاند..هتد ) گەهشتنە

دویماهیکا خۆ, ئیدی مە پێدڤی ب ڤان جۆرێن جوانکرن و هزرکرنێ نەما و ئەڤە ژی گوتن و گوتارەك جیاوازی کوژە و تەڤ دانێن ئەڤی سەردەمی وەها دسەلمینن کو ئەڤ سەردەمە، سەردەمێ زقبوون و وەرارا جیاوازیایە، و ناهێتە پێشبینی کرن کو تەڤ جیاوازی بێنە لابرن یان دئێك فۆرم وقالبدا بێنە بهوشتن، ئەگەر وەها بیت، دبینم کو جیهانەك سەیر و بێ تام و چێژ و روح دێ بەرپا بیت و ئەم تەڤ دێ بینە فۆتۆکۆپیێن هەڤدوو و ئەڤ جیهانا مە یا خۆش و پڕ تامە ب هەبوونا ئەڤان جیاوازیان و ئەم تەڤ دزانین کو رۆژئاڤا مفا و چێژەك پڕ مەزن ژ بیناسازی و چاند و هونەر و ئەفسانەیێن رۆژهەلاتێ وەرگرتینە و ب دەهان قاتان ئەم ژ لایێ زانستی و تەکنەلوژی ڤە مفای ژ عەقل و دەستکەفتێن وان وەردگرین و دایەلوگا بازێرڤانی ب ڤی ئاوایی دروست دبیت کو هەر ئێك ب تایبەتمەندی و مۆرکێن خۆ تێکهەلیبان دگەل هەڤدوو بکەت.

مە دیارکر کو هەلبەست ئەو ژانرێ ئەدەبی یە ئەوێ دکاریت دنێڤبەرا پەیڤ و رامان و دەلالاتێن واندا بیاڤەکا تنگژینێ ب رەخسینیت، کو دبیاڤا هەنێ دا ڤارێبوون دروست ب بن , و ب بنە ئەگەرا ڤارێبوونێن ئاڤاکار هەتا دوارێ هزرکرنێدا ژی.. و رستەیا شعری ئەو رستەیە ئەوا د هوندرێ وێ دا، هند پەیوەندی دنێڤبەرا پەیڤاندا دروست ب بن کو بەرییا گوهدێریکرن و نەمازە خویندنا وێ ، خوینەڤانی وەکو وەرگر هەست نەکر بیت کو ئەڤ تێکهەلی و هەڤبەندی یە دنێڤبەرا واندا دروست دبن، و لڤێرە زمان گەشیێ بخۆڤە دبینیت و ئاشوپا مرۆڤی زیندی و بەرفرەهتر دکەت و چێژ وجوانییێ ب

مەرا دگەهینیت.. و داکو پتر درێژاهییێ ب گوتنێن خۆ نەدەم دبێژم، نها دویێ باوەریێ دامە کو هەتا زمان مایە ئامرازێ تێکگەهشتنێ دنێڤبەرا تە و ئەوێن دی دا، دێ ب رێکا زمانی هزر و چاند و کلتور و هەتا زانست ژی گەشییێ بخۆڤە دبینن و دڤێ قادێ دا هەلبەست دمینیت وەکو جوان و رندترین ژانرێ گوتن و نڤیسینێ.

دەما من ئەڤ هەلبەست و تێکستە خاندین ، و من هەول دای خویندنێن خۆ ژێرا بکەم، بەریا نڤیسینێ من تا رادەیەک باش چێژەک ژێ وەرگرتی یە و بۆ دەمەکی دگەل پەیڤ و رستە و بیروکە و وێنە و کەسانێن وان ژیامە و ئەڤ هوکارە بووینە ئەگەرا پالدانا من کوتێکستەک دی لسەر ئاڤابکەم و ئەگەر تێکستێن من نڤیسین د ئاستێ داهێنان و ئەفراندنا نڤیسەرێ ئێکان دا نەبن، داخوازا لێبورینێ ژوان دکەم و دبێژم ئەڤە ئێك ژخویندنێن منە و دبیت ئەگەر دەرفەت هەبا من چەندین خویندنێن دی ژی ژێرا کربانە و دیسان دبیت خەلکەک دی ژی هەبیت کو خویندنێن کویرتر بۆ ڤان تێکستان هەبن و ب نێرین و لایەنەك دنڤە ڤەخوینن.

هەروەسا داخوازا لێبوورینێ ژ هندەك هەلبەستڤانێن دی دکەم کو دەرفەت نەبوویە مرۆڤ لسەر تێکستێن وان ب دروستی راوەستیت و دەقەك دی لسەر ئاڤا بکەت و ب راشکاوی ڤە دبێژم هنەك تێکست هەنە دقادا ئەدەبێ کوردی دا کو دشیانێن من دا نەبووینە لسەر ب پەیڤم.

# سەمایا وێنەیێن هونەری
# دکەڤالەکێ رویسێ هەلبەستڤان شەهباز دا

(کەڤالەکێ رویس) دیوانەکا شعری یا هەلبەستڤان (شوکری شەهباز)ە , ژمارە (٤٧) ژ زنجیرا وەشانێن ئێکەتیا نڤیسکارێن کورد لقێ دهوک وەرگرتیە , (کەڤالەکێ رویس) دەهـ نموونێن شعری یێن هەلبەستڤان شەهبازی ب خوڤە دگریت , کو ئەو ب خوە دبێژیت:,,ئەڤە دەهـ نموونێن شعرینە, من بێت هەلبژارتین ژ سەربورا خویا شعری , هیڤیە ب دلێ خویندەڤانێ شعرا کوردی بن,, ل دەستپێکێ من دڤێت بێژم کو ئەم دکارین ژ ڤێ پەرتووکێ رابێژین ئەلبوما هەلبەستێ یا هەلبەستڤان شوکری شەهباز , چونکە نە ب تنێ خویندەڤان دێ لسەر کۆمەکا ژبن نەهاتی ژ رستە و وێنەیێن شعری هەلبیت, بەلکو پەرتووکا هان ب شێوازێ ئەلبومێ هاتیە چاپکرن , و تێدا هندەک مۆنتیڤ و پۆرترێت ب خامێ هونەرمەند

ستار عەلی هاتینە راكێشان دێ بینیت و هەروەها بەرگەكێ جوان و بكەڤالەكێ سەرنجراكێش و پڕ دەلالەت ، ژ لایێ دیزاینەر (عیسام حەجی تاهر) ڤە ئەلبووما هان هاتیە تەوزاندن .

هەر چەندە هەلبەستڤان ، دەنگەكێ نوی نینە دقادا هەلبەستێ دا ، و مە ئەڤە بۆ دەمێ پتر ژ بیست سالایە ، شەهباز ناسییە وەكو هەلبەستڤان ، لێ وەكو پێدڤی نەهاتیە ناسین نەمازە ل دەڤەرێ سنورێ و ب تایبەتی ل بازێرێ دهوكێ . دبیت گەلەك ئەگەر هەبن بۆ (نە) ڤێ یەلاڤبوونێ ، لێ ب باوەرا مە ئەڤە ڤەدگەرێتەڤە ژ بۆ هندەك ئەگەرێن دویر ژ ئەدەب و هەلبەستێ ، مینا نەپشكدارییا وی د ڤیستەڤال و سمینارێن ئەدەبی و ئێڤارییێن شعری ، و مە چ جاران گوهـ لێ نە بوویە كو هەلبەستڤانی پشكداری دڤان هەلكەفتا دا كر بیت نەمازە ل دەرڤەی پارێزگەها دهوك . ئەڤە وێ چەندێ راناگەهینیت كو خوەدی دەنگ و فورمەك بلند نینە ، بەروڤاژی ئەڤێ چەندێ خویندەڤانێ شارەزا و سەرهەل ل سەر هەلبەستا كوردی ئەوا ب زارێ كرمانجی یا ژوری دهێتە نڤیسین دكاریت ، ئەو هەلبەستا كوردی ئەوا ب خامێ شەهبازێ شاعر هاتیە نڤیسین ، د نێڤا دەهان تێكستێن دن دا ڤاڤێر بكەت ، چونكە فورم و دارێژتن و وێنەیێن وی یێن شعری و جیهانبینییا وی جودایە دگەل هەڤكارێن وی ، و ئەز وەكو ئێك ژ خویندەڤانان دبێژم كو شەهباز خوەدی فورمێ خوە یێ تایبەتە و ب شارەزایی سەرەدەرییێ دگەل تەڤ پێكهاتەیێن كارێ شعری دكەت ، دگەل رستەیا هەلبەستێ و بكارئینانا هێمایان دیسان دگەل وەرگری وەكە جەمسەرەكێ گرنگ

دهەر کارەکێ ئەدەبی دا , هندەك جاران دەما مروڤ هەلبەستێن وی دخوینیت هەست دکەت , نەمازە دەستپێکا هەلبەستێ دا , کو شەهباز یی تێکستا خوە ب زمانەکێ ئاسایی دنڤیسیت , یان کو ب شێوەیەکێ راستەوخوە هزرا خوە ئاراستە دکەت .

مروڤ هەست دکەت کو یێ گوهدێرییا سەرهاتیەکێ دکەت , یان ب زمانێ گوتارێ تێکستا خوە دبێژت یان یێ پەسنەکی دکەت , تێدا پتر ڤەگێران یا زالە . ئەز باوەرم کو ئەو ژی مینا مە وێ هەستێ دکەت کو یێ ب فورمەك سڤك دنڤیسیت , لێ ئەو ب شارەزایی ب ڤی ئاوای دەست ب نڤیسینێ دکەت , وەها دبینم کو مەرەما وی دوێ گاڤێ دا ئەوە , خویندەڤانی بۆ پروسیسا وەرگرتنێ بەرهەڤبکەت , یان وی نەڤێت هەر ل دەستپێکێ خویندەڤان تووشی ڤەجنقینێ ببیت , بەلکو وەها ل وەرگری بکەت , کو ب تەڤ هەست نەستێن خوە ڤە بەر ب تێکستێ ڤە بێت , لێ هەتا دویماهیکێ ب ڤی رەنگی تێکستا خوە دانارێژیت , بەلکو ژ نشکەکی ڤە , یاخی دبیت لسەر وێ فورما سڤك , ڤارێبوونەکێ د رستەیێن خوەدا دروست دکەت , بەر ب شکاندنا زمانێ هان ڤە دچیت , تەڤ ئەو هزرێن دگاڤا ئێکان دا د مێشکێ گوهدێری یان خویندەڤانی دا بەرجەستە بووین تێنە هەلوەشاندن , جیهانبینی و هزرێن مروڤی بەر ب سەنتەك دی دبەت , کو چ جاران یا چاڤەرێ نەبوو , ل ڤێرێ خویندەڤان تووشی ڤەجنقینێ دبیت لێ دنێڤ ریتوالێ تێکستێ دا کو بەری یا هنگی ژ لایێ هەلبەستڤانی ڤە کار بۆ هاتیە کرن.

شوكرى ب شارەزايى, دابرينىٚ د نیٚڤبەرا زمانىٚ ڤەگیٚرانىٚ و زمانىٚ هەلبەستىٚ دا چیٚدكەت , ئەو ژى پشتى كو مروڤى بەر ب تیٚكستا خوە دبەت , ل وى دەمى سەرسورمانەك ل جەم وەرگرى دروست دبیت و تووشى ڤەجنقینىٚ دبیت و هندەك رەخنەگر ژیٚرا دبیٚژن , ڤەجنقینا وەرگرتنىٚ .

هەلبەستا دەهىٚ دڤىٚ كوٚمىٚ دا , كو بناڤىٚ (رویدانیٚت فلمەكىٚ بىٚ سیناریوٚ) یە . ب ڤان رستەیان دستپیٚدكەت:

ل سالا ١٩٨٣

كاتژمیٚژ دووى پشتى نیڤا شەڤىٚ .... ل بەغدا

ل بەرامبەر وەزارەتا ناڤخو

پولیسا ئەز و برادەرەكىٚ كەركوكى داینە بەر قونتاخیٚن تڤەنگا

هزار و ئیٚك تف كرنەمە

چنكو ئەم سەرخوش ببوین و مە ستران ب كوردى د گوتن

ئەز و ئیٚكىٚ خەلكىٚ نەجەف و هەڤالەكىٚ سومالى و كچەكا بەربەر و برادەرەكىٚ ئەرمەن

مە پیلان دانا.......

فروكەكىٚ ژ فروكخانا بەغدا برەڤینینە تەلئەبیب

ل دووماهیك قوناغ ئەز نەویٚرام

ئینا مەسەلە ژ بنى تیٚك چوو

.............٦٠-٦١

هەر چەند ئەڤ دەقە ژی دکاریت هەمبیزا هژمارەك ڤەخویندنان بکەت , وەرگر دکاریت لسەر کومەك ناڤا راوەستیت (بەغدا , تەلئەبیب , کەرکوك , سومالی , نەجەڤ , کچکەکا بەرەبەر , برادەرێ ئەرمەن ...هتد)و هەلبەت دێ هەول دەت بزانیت ئەو چ پەیوەندییە , جه و مروڤێن هان بهەڤرا گرێددەت , هەروەها ل ڤێرێ پرسیارەك گرنگ دهشێ مروڤی دا جهگیر د بیت , بۆ ئەو وەکو مروڤەکی کورد ل دووماهیك قوناغ نەوێرا؟ ڤێ چەندێ چ پەیوەندی هەیە ب دەروونێ مروڤەکێ کورد ڤە؟ یان ڤێرێ بتنێ نوینەراتییا خوە دکەت وەکو تاکە کەس , نەك وەك نەتەوە؟!

لی وەکە دیار د رستەیێن هان دا , زمانێ ڤەگێرانێ یێ زالە, دەسپێك ڤەگێرانا بویەرەکێیە , لێ دبیت , زمان بەر ب تیربوونێڤە دچیت , هەتا کو مروڤی د ئێخیتە هەمبەر چەند رستەیێن هەلبەستێ :

چاڤێت تە خوشترین رۆژە
بیرهاتنێت من تێدا دخەو دچن
ئەز هەست پێ دکەم
هەمی تشت ژ تە دەست پێ کەن و
دناڤ خولیدانکا جگارێت من ب دووماهیك تێن
٦٢............

دهەر رستەیەکێ دا ڤارێبوونەك هەیە , ئەو ژی ب رێکا دروستکرنا پەیوەندیەکا نوی د نێڤبەرا هندەك پەیڤان دا , کو بەرییا هنگی

مروڤی هزر ژێ نەدکر , کو دنێڤبەرا پەیڤێن هان دا دێ پەیوەندیەک دروست بیت. و ل پەی دیدا مە زمانێ هەلبەستێ ئەو زمانە ئەوێ دکاریت هەر و هەر پەیوەندیێن نوی د نێڤبەرا پەیڤان دا بەرجەستە بکەت . و هە روەها بکاریت پەیڤێ یان هێمایێ ژ رامانێن وی یێن فەرهەنگی و دووبارەکری فورتال بکەت , بەر ب رامانەک نوی ببیت , یان کو هەلبەستڤان دوێ گاڤێ دا یێ سەرکەفتی بیت دەما هێمایێن کەهی رامانەکا نوی ژێرا ببەخشیت:

چاڤێت تە خوشترین رۆژە

ئەگەر شوکری گوتبا (چاڤێت تەکانی نە , یان ژی چاڤێت تە دەریایەکا پڕ نهێنی نە ....هتد) دا رستەیێت هان , کەهی و دووبارە کری بن , یان دەما د بێژیت:

ئەز هەست پێ دکەم

هەمی تشت ژ تە دەست پێ دکەن و

دناڤ خولیدانکا جگارێت من ب دووماهیک تێن.

رستەیا ئێکێ و یا دوویێ , وەها دبینم کو رستەیێن کەهینە , و مە چەند جاران گوە لێ بوویە , لێ دەما تێتە رستەیا سێیان , ڤارێبوونەک هونەری جهگیر د بیت , و کۆپلەیا هەلبەستێ بەر ب لوتکێڤە دبەت . چونکە ل ڤێرێ هەلبەستڤانی کار دنێڤ زمانی دا کری یە , یان ئەگەر شوکری گوتبا (دناڤ چاڤێن من دا ب دووماهیک تێن) جارەکا دی رستەیەکا کەهی و چ وێنەیێن هەلبەستێ دهشێ خویندەڤانی دا دروست نەدبوون , لێ دەما ئەوی یاری ب پەیڤان کری , شیا خویندەڤانی بێخیتە هەمبەر رستەیەکا هەلبەستێ , کو

ئەو رستە بكاريت كومەك خويندنا هەمبێز بكەت و وێنەيەكێ دهشێ وى دا گەلالە بكەت.

خوليدانكا جگارا: ژ رامانا وێ يا باو و ئاسايى ڤالا دكەت , ل ڤێرێ خوليدانك , جەڤەنگسازيەك نوى هەمبێز دكەت , وەكە هێمايەكێ نوى تێتە بكارئينان , وەها لێ دكەت كو پتر ژ چاڤان دەلالاتا بدەت , دكاريت هندەك ئامارە و ئيحائاتان دهشێ مروڤى دا بئافرينيت , ل بەرچاڤێت من وەكو خويندەڤان خوليدانك جوان بوو , نها دكارم دەما تەماشەى وێ بكەم چيژەكا بێ سنوور ژێ وەربگرم . شەمبازێ هەلبەستڤان شيايە تشتەكێ كرێت ل بەر چاڤێن مە شيرين و جوان بكەت.

دبيت مەبەستا وى ئەو بيت , كو ئەم هەمى بەر ب سوتنێڤە دچين , يان هەمى تشت بەر ب سوتنێڤە و ل دويڤ دا بەر ب سەبەتكا گلێشى و گيفانكان ڤە دچن , يان د هەلبەستێ دا كێرفا رەشبينيێ و جيهانبينييا وى دا هەر و هەر بەر ب بلندبوونێ ڤە دچيت.

لێ ئەم وەكو خويندەڤان نەچار نينە كو ب هەمان مەبەست پێگير ببين , ئەز بەروڤاژى بەرێ خوە ددەمێ دبينم كو دەما تێينە سوتن , دێ ژ گونەهان تافيل بين , هەر وەها دبيت مەبەستا وى ئەو بيت كو چو هيڤى و ئوميد دڤى (وەلاتێ پركارەسات ) دا بجھ ناهێن , گشت جوانى بەر ب كرێتبوونێ ڤە دچن , يان بێزاربوونە ل ژيانێ , لێ بەرامبەر ژى دێ كارين ب خويندنەك دن بخوينين ئەو ژى هەمى تشت بەر ب پاكى و بژينينێ ڤە دچن چونكە هەلبەستڤانى ڤالاتيەك

ددەڤا خوە دا هێلایە ڤەکری داکو ئەمێن خویندەڤان ب خویندنێن خوە پڕ بکەینەڤە.

هەروەها دەما مروڤ پتر لسەر هەلبەستێن شەهبازی رادوەستیت , دێ هایداری دوودلییا هەلبەستڤانی بیت , دوودلییا هان ژی یا ئاڤاکری یە لسەر ڤان بنەمایان (نەبوونا باوەرییێ , ترس , گومان , رەشبینی , کەرب , یاخیبوون لسەر هزرێن زال , پەیوەندییێن قەیرانکی دنێڤبەرا وی و ئەوێ دیدا).

د هەلبەستا وی یا ئێکان (قنارە کرن) دا هاتیە :

**دەما چاڤێت تە بووینە روژ**

**ئەز بوومە تیرۆژك**

**دەما سینگێ تە بوویە دەریا**

**ئەز بوومە پێل**

**دەما کەزیێت تە درێژ بووین**

**بووینە وەریس**

**تە ئەز پێ قنارە کرم.....** ل.٧

دیار دکەت کو پەیوەندییا وی دگەل ئەوێ دی , پەیوەندیەك قەیرانکییە , ل دەسپێکێ یێ پێگیر و پابەند ب ئەوێ دیڤە , تارادەیەکێ ئەوێ دی دبیتە نەژاد و ژێدەر و سەنتەر و ئەو بڤێ رازیبوونێ خوە ددەتە نیاسین وەکو پشکەك سروشتی و ئەکتیڤ دپرۆژەیێ ئەوێ دی دا ,دەما گوهرین د ئەوێ دی دا دروست دبن , ئەو ب شێوەیەکێ میکانیزمی ب گوهرینێن وی قایل دبیت , ل ڤێرێ ژی رەگەزێ سوزێ یێ زالە لسەر رەگەزێ عەقلی:

ڕۆژ.......................................... تیروژك

دەریا ..................................پێل

لێ دەما لایەنێ دی , سەردەست , یان دەما سەنتەر دەسهەلاتێ وەردگرێت , پەیوەندیا وی دگەل ئەوێ دی دگەهێتە رادەیا ژنافبرنێ:

کەزی ............ وەریس..........................قنارەکرن

جوانی ............ئامرازێ چەوساندنێ..................ژنافبرن

ل پەی خاندنا مە (وەریس) وەکە هێمایەکێ بهێز تێت و سەرجەم پیڤەرێن سادە و جوان و رند و ئەوێن د جڤاکێن ساکاردا گەلالەنەدا تێك ددەت چونکە رەگەزێ بەرژەوەندییان دڤێ قادێ دا , رولەك سەرەکی و کاریگەر دلەیزینیت و تەڤ پیڤەران جارەك دن لسەر ستراکتورێ پاراستنا بەرژەوەندییێن دەسهەلاتێ تێنە دارێشتن و تەڤ ڤەکولینێن دیروکی وەها بۆ دچن کو بەندیخانە و قنارە دگەل دەستهەلاتێ پەیدابووینە و د دگەل وەرارا وێ وەرار بخوڤە دیتیە . و ئەو پەیوەندییێن لسەر رەگەزێ سوزێ ئاڤا دبن یان لسەر لوژیکا هان تێنە برێڤەبرن بەردەوام لایەنەك بچوك وکوّلەیە بۆ لایەنێ دوویان , یان ژی پەیوەندیەك ئێکسان دروست نابیت , و ژبەر ڤێ ئێکێ ژی پەیوەندییێن لسەر لوژیکا سوزدارییێ تێنە ئاڤاکرن هەمیشە د مەترسییێ دانە و دوودلیەك کوژەك دناخێ مروڤان د جڤاکێ هان دا دلەیزیت.

لەوما دکۆپلەیا دووماهیکێ دا , پەیوەندییا هەلبەستڤانی بەر ب وێرانبوونێ ڤە دچیت کو شێوازەك دن بخو ڤەدگریت , ئەو ژ رەخنەگرتنا دەستهەلاتێیە.

ل ڤێرێ ژی هژمارەك پرسیارێن گرنگ دهشێ مروڤی دا تێنە ئاراندن , وەرگر دکەڤیتە هوندرێ دوودلیەکا مەزن و ترسناك دا , پرانییا پرسیارێن هان ل دۆر دەستهەلاتێ دزڤرن , چما دەستهەلات و هێز , رەوشت و پەیوەندییێن دنێڤ مروڤان دا , د نێڤ کۆمێن جڤاکی یێن جیاواز دا تێکددەن ؟ چما دەستهەلات تا رادەیەکا مەزن ژ پەیڤا (ئەو) و رەخنێ دترسیت ؟ چما ڤناریێ د فەرهەنگا دەستهەلات و کلتورێ مەدا , ئەڤ بەرهەڤبوونا خوە یا خورت و هێزدار هەیە؟

دهەلبەستا (رویدانێت فلمەکێ بێ سیناریۆ دا) شەهباز دبێژیت:

تو دزانی تێکهەلکرنا رەنگا
نە تشتەکێ ب ساناهییە و
تو رەش و سپی ب تنێ دبینی
لەومان ... هەڤرکی دناڤبەرا من وتە دا بەردەوامە
لڤی وەلاتێ پڕ کارەسات .. ل٦٦

دیسان خویایە کو پەیوەندییێن دنێڤبەرا وی و ئەوێ دا , پەیوەندیەك پڕ دوو دلی و تنگژیە , هەتا وی ئاستی کو پەیوەندی یا هان کارتێکرنا خوە یا نێگەتیڤ دکەتە سەر پەیوەندییێن وی ب جهی و دەمی و رۆژگاری ڤە.

دوودلی و تنگژییا هان تەڤلیبوونا خوە هەیە و هەر دەم هەلبەستێن ڤیێ کوّما هەلبەستێ دا.

هەلبەستڤان ئەویێ دی ب رەهایی و ئێك لایەنی و سادەیی تاوانبار دکەت , ل پەی دیدا وی , ئەویێ دی نەشێت دجیهانەکا هەمەرەنگ دا بژیت , یان ژی قایل نابیت ب جڤاکەکیێ هەمەرەنگ و هەمەدەنگ و پلوّرال , یان ژی ییێ بوویە ئاستەنگ درێکا پێشڤەچوونا جڤاکی و ئازادییا عەقلی دا :

سەرێ من ییێ کریە چانتەکیێ قفل کری و
ب دیوارێ ژیانیێ ڤە ییێ هەلاویستی
ئەزمانیێ من ییێ گرێدایە و
هەمی نهێنی ئەڤە ل دەڤ من — ل٦٥-٦٦
یان دەما دبێژیت :
ئەڤ بازێرە زیندانەکە و
ئەڤ رۆژە سندریکا هزرێت منە — ل٥١

ل ڤێرێ (شوکری) ییێ رەخنیێ ل عەقلیێ زال دگریت(نەبوونا ئازادییێ , داگیرکرنا عەقلی , نەبوونا زەلالی ییێ) کو ئەڤە ژ ساخلەت و سیماییێن جڤاکێن رەها و گرتینە , لیێ شەهباز ب هەمان لوژیك سەرەدەری ییێ دگەل ئەویێ دی دکەت , کارەك رژد و عەقلانی ناکەت ژ بوی هەلوەشاندنا ئەوی لوژیکی ئەوا هزرێن ئێك لایەن پروژەکتیێ خوە ییێ یەقینی لسەر ئاڤا کری , لوژیکا هەبوونا هەڤرکیێن بەردەوام دنێڤبەرا دوو ئالیێن ژ ێك جیاواز دا ( لەوما هەڤرکی

دنێڤبەرا من وتە دا یا بەردەوامە ) بەردەوامی یا هەڤڕکییا کە واتە نەبوونا چ پرێن دایلوگ و دان و ستاندنێ , دفەرهەنگا مەدا هەڤڕکی ب تنێ ئێك رامان هەمبێز دکەت ئەوژی : ئێك ئەوێ دی ژ ناڤ ببەت , نەك ئێك ئەوێ دی بگەهینتە پەژراندنێ کو بکارن بهەڤرا پروژەیەك ڤەکری دارێژن کو گشت جیاوازی پێ بهێنە برێڤەبرن و هەردوو دانپێدانی بهەبوونا هەڤدوو بکەن و گرژی و قەیران دنێڤبەرا وان دا نەمینن و باوەری جهگیر ببیت , چونکە بنەمایێ هەرە سەرەکی دئاڤاهییێ جڤاکێن پێشهەل دا باوەرییە.

ئەز هەست پێدکەم پولیسێت ڤی بازێری
یێ ل من دگەرێن                    ل٣٩

(ترس و نەبوونا باوەریێ) ژ پشت هەر پەیوەندیەکا قەیرانکی هەنە , ل پەی دیدا هەلبەستڤانی, دەستهەلات , داکو دەستهەلاتا خوە بپارێزیت یا ئامادەیە هەمی تشتێن جوان کرێت بکەت , مروڤێن بێ گونەه بکەتە قوربانی , ئەڤەژی ب درێژاهیا دیروکێ ئێك ژ ساخلەتێن دەستهەلاتێ بووینە , و هەتا ئەڤرو ژی ل رۆژهەلاتێ ژ ناڤبرنا ئەوێ دی یێ جیاواز رەوشتەك رەوا و سروشتییە ل جەم رەئیا گشتی بەرییا دەستهەلاتێ ژی:

ئەو زەلامێ بەری دوو دەقیقا
ژ دەرمانخانێ ڤالیوم کڕین
دناڤ کابینا تەلەفونێ دا نڤستی و
بەری دوو دەقیقا ل ئیشکێ زڤڕی
ل کولانا بەرامبەر دێرێ هاتیە کوشتن

ئەدرێسیێ من یێ د بەریکێ دا    ل ٣٩

(ل کولانا بەرامبەر دێرێ هاتیە کوشتن) دڤێت بێژیت کو جهێن ئارام و تەنا دڤی وەلاتی دا نینە , دێر وەکو جهەکێ پیروز و دپلاتفورمێ خوەدا , داخوازا سینگفەرهی و گیانێ لێبورینێ دکەت , دێر ب خوە یا دمەترسییێ دا مینا گشت کتێب و نڤیسین و دەنگێن داخوازا مروڤدوستی و ب هەڤرەژیانێ و تەباییێ دکەن.

(ئەدرێسیێ من یێ د بەریکێ دا ) کە واتە پەیوەندیەك دنێڤبەرا وی و ئەوێ (ل کولانا بەرامبەر دێرێ هاتیە کوشتن ) دا هەیە , لڤێرێ ئەو دوودلی و ترسا دهوندرێ ناخێ هەلبەستڤانی دا هەی پتر خورت دبیت .

تا دگەهیتە وی رادەی کو ئەو ژ رەنگێت جلکێت ل بەر خوەدا دترسیت . گومانێ ل هەر تشتەکی دکەت , (ژ مروڤێ روینشتی ب رەخ وی ڤە , لڤینا دەستا ) لێ پێدڤییە جارەك دن بهێتە گوتن کو شەهباز هەر چەندە لسەر پرسگری و مژارێن گرنگ یێن ڤەگرێدایی ب پەیوەندی , و مروڤان و ئایندە و نها ڤە .... هتد دپەیڤیت , و هندەك جاران زمانێ نڤیسینێ نیزیك د بیت ژ زمانێ گوتارا راپورتێ , لێ د هەمان دەم دا ئەو زمان ب خوە ژی دکاریت خویندنێن سادە رەت بکەتەڤە , چونکە ب شارەزایی هاتینە نڤیسین و ئاراستە کرن و هەر دنێڤ هەمان تێکست دا , دبینین کو خوە دویر دئێخیت ژ شەپولێن گوتارا راستەوخوە, بەر ب جەڤەنگسازیێ ڤە دچیت بەرب

كووراتيبا ناخێ تاكه كەسى ڤە دچيت , ب شێوەيەكێ هونەرى بارێ دەروونيێ وان دخوينيت:

پيرەميرێ هەيێ بريێت وى سيبەرێ
ل مژويلانكا دكەن
ب چاڤان د ئاخڤيت
پێنا ل سيتافكا خوە ددەت
هەكو لەشێ خو يێ بێزار دبيت
دبوريا سوپێ را بەرێ خو ددەت
لێ بەرچاڤێت وى
هەيڤ شيشەكا شكەستە ل هنداڤ عەورا
ژوردا بەرێ خو ددەت
بلنداهى و لغاڤێ دەڤێ وى
دكەڤنە بەر پێيا ل٣٨

ل ڤێرێ ديار دبيت كو زمان نە بتنێ ئامرازەكێ دەربڕينێيە , بەلكو ب رێكا زمانى مروڤ دێ كاريت كەڤالەكێ جوان و قەشەنگ و پڕ رامان ب نەخشينيت, برێكا رستەيا هەلبەستێ دێ كاريت دەربڕينەكا هونەرى و ستاتيكى ژ هەست و نەستێن خوە بكەت , ل پەى ديدا مە دڤان رستەيان دا , هەر پەيڤەك رەنگەكە و ب فرچێ هونەرمەندەكێ شارەزا تێكهەل بووينە , كو ب لێدانا فرچێ ديماهيكێ , كەڤالەكێ جوان هاتيە بەرهەم ئينان , و ژلايێ

ناڤەروکێڤە هەلبەستڤان دیار دکەت کو ئەم یێن ل هەمبەر هندەك گوهرینا و ئەڤ گوهرینە دێ کارتێکرنا و باندورا خوە کەن لسەر تەڤایا دید و بوچوون و نێرینێن مە.

هەر چەندە دهەلبەستێن شەهبازی دا , ڤان پەیڤان (وێسکی , جگارە , خولیدانك , مژ , شەڤ , خەیال , تاری, ئاڤابوون , سیتافك , شیشەیێن شکەستی , ڤالیوم , دویکەل , سەبەتکا گلیشی , لەشێ رویس, پیانو و تەمبوورێن وەستایی ...هتد) تەڤلیبوونا خویا بەردەوام هەیە دنێڤ ئاڤاهیێ هەر دەھ هەلبەستێن دڤێ کومێ دا , د بیت گەلەك جاران وەها بهێت گوتن کو پەیڤ و هێماییێن هان ریتوالەکێ ئاشوپگەری و بێهودەیی بەرجەستە دکەن , لێ ل پەی ڤەخویندنا مە , ل ڤێرێ یا خیبوون یا زالە ل سەر ئاشوپگەری و ئاڤاکرن یا زالە لسەر بێهودەییێ, ل ڤێرێ هەلبەستڤان یێ ل دویڤ ئازادییا خوە دگەرێت و ئازادی ل جەم وی دبیتە مەرجەك ژ مەرجێن تەنابوونێ , ب رامانا مروڤ و جڤاك تەنا و ئارام نابن ئەگەر ب ئازادی و بێ ترس و دوودلی بهەڤرا نەژین.

دهەلبەستا (مرن) دا هاتییە:

**شەڤ لەشەکێ مرارە د چاڤێت من دا**

**ل کوژیێ هە**

**تێلەفزیونەکا ترنسستەر سوتی**

**ساکویەکێ خەمگین ب دیواریڤە یێ هەلاویستی**

شیشەکا ویسکی یا ڤالا و
خولیدانکەکا تژی قوپکێن جگارا و
چەند پەرکێت رۆژناما
با یاریا پێ دکەت ...........٥٠-٥١

تەڤ پەیڤ د پەیڤینەك دۆمدار دانە , بهەڤرا تابلویەکا سوریالی دروست دکەن , هەلبەستڤان د حالەتێ دایەلوگەك مەنەلوگێ و نێڤخوەیی دایە , داکو شەڤا مرار تیلەفزیونا ترانسستەر سوتی و ساکوییێ خەمگین و ژکاری کەفتی ... هتد بپەیڤینیت , داکو نەرازیبوونا خوە ژ ڤێ بێدەنگیێ بکەتە کارەك ژ بوی لڤاندنێ , داکو جارەك دن رۆژنامە بهێنە خویندن , خویندن ببیتە پروسیسەکا بەرهەمدار , داکو د نێڤبەرا وی جهی دا ئاشتبوونە ڤە ببیت , یان دەما د هەلبەستا ( رویدانێت فلمەکێ بێ سیناریو ) دا دبێژیت:

شەڤ هندە دکورتن
مروڤ ناگەهیت تێر وێسکی بێ ڤەخوتن ........٦١

دگەردوونەکێ هەلبەستی دا , شەهباز سەرەدەریێ دگەل شەڤێ و جگارا و وێسکی یێ وەکو سوفیەك دکەت , وێسکی دبیتە ئامرازەك ژبوی پتر تێڕامان و هوشمەندیێ , یا وی دڤێت بێژیت کو شەڤ هند دکورتن مروڤ ناگەهیت دگەل خوە بمینیت و پتر تێڕامانیێ بکەت , پتر چێژێ ژ بێدەنگیێ وەربگریت , خوەیایە دکەلتوریێ مەدا , شەڤ

دەمیَ بێدەنگی و تارییَ یە و دریتوالەکیَ تاری و بێدەنگ مروڤ دیَ کاریت هویرتر هزران بکەت . شەڤ ل جەم وی بەرجەستەکرنا هاڤیبوونێیە , لیَ هاڤیبوونەکا بەرهەمدارە , هویر و هویر گوهدێریا دەنگێن ماندەل کری دکەت , دگەل دەنگێن هان پەیمانەکیَ د بەستیت , داکو ئەو دەرزا هەی د نێڤبەرا وی و جهی دا , دنێڤبەرا وی و دەمیدا , ب تشتێن جوان و دلڤەکەر مشت بکەنەڤە و ئێدی دگەل دەورووبەریَ خوە ئاشتبوونەڤەکا گشتی رابکەهینن و باوەرییَ د نێڤبەرا واندا ببیتە بناغەکیَ موکم کو پەیوەندیێن نوی ل سەر بهێنە ئاڤاکرن , ئەم دبینین کو تەڤ هەلبەستێن شەهبازی دا بانگەوازیەك وەها هەیە , لیَ بانگەوازیا هان یا ڤەشارتییە , دنێڤبەرا رستان و ئەو رستەیێن ل پشت دا هەنە و هاتینە نخافتن . و ب ڤەشارتن و نخافتنا حەز و خواستان , کووراتیەك ئیستاتیکی و راماندار ژێرا پەخش دکەت.

بتنیَ مایە دبێژیت , ئەگەر مە بڤێت ل سەر دیاردێن نوی د هەلبەستا کوردی دا بنڤیسین , پێدڤییە ل سەر هەلبەستێن شوکری شەهبازی راوەستین , و مە د ڤەخویندنێن خوە دا دیت , کو وێنیَ هەلبەستیَ د هەر رستەیەکیَ دا سەرخوەبوون خوە هەیە , یان هەلبەست خوەدی وێنەیەکیَ سەنتەری نینە ,چونکە دهەلبەستا کوردی دا یا زل ئەوە کو وێنەیەکیَ هەلبەستیَ هەبیت یان کو وێنەیەکی دایك هەبیت دەربرینیَ ژ حالەتەکی بکەن ، ئەوین دی ژی

دهێن دا کو پتر وی حالەتی راڤە بکەت و دخزمەتا وێنییێ سەنتەری یێ دایك دابن و ب درێژاهییا هەلبەستێ و تەڤ وێنە و رستەیێن دی ل دوڕ وی وێنەی دزڤڕن , لێ دکارم بێژم کو شوکری هەول دایە مرنا وێنێ سەنتەری ئاشکرا بکەت و ل جیاتی وی وێنەی , رستەیا هەلبەستێ دروست بکەت و ل پەی دیدا مە ئەڤە ژی دیاردەك نوی یە د هەلبەستا کوردی دا , نەمازە ئەو هەلبەستا ب زارێ کرمانجی یا ژۆری دهێتە نڤیسین , و ئەز باوەرم کو ڤێ دیاردێ پێدڤییە پتر ل سەر باخڤین , چونکە هەبوونا وێنێ سەنتەری و ڤەرەڤینا وێ یا ڤەگرێدای و هەڤبەندە ب سیستەمێ هزرکرنێ ڤە.

# دەمامکێن سەر بەردایی
## خویندنەك دهەلبەستێن هەلبەستڤانیێ عیراقی "مونعم ئەلفەقیر" دا

نڤیسکار و رەخنەگرا دانیمارکی (گرێتە گوستبۆل)* لدۆر هەلبەستێن هەلبەستڤانیێ عێراقی (منعم الفقیر) دبێژیت: خوزی هەلبەستێن وی بگەهنە ژمارەکا هەرە زۆر ژ خویندەڤانان، کو پترین کەس سەرهەلی ئەزموونەکا هەلبەستی یا نازك و ئاست بلند ببن.

نە ب تەنێ ڤێ گوتنێ ئەم پالداین کو هندەگ ژ هەلبەستێن هەلبەستڤانیێ عێراقی – دانیمارکی وەربگرین و لدیڤدا لسەر بنڤیسین، بەلکو بەریا ڤێ گوتنێ ڤەخوینم، د ئێڤارییەکا هەلبەست خویندنێ دا، مە گوهدێریا وی هەلەبستڤانی کر، من هەست دکر کو

پێدڤیە پتر هەلبەستێن وی ڤەخوینم. چونکە من وەها ددیت کو ب زمانەکێ زەلال و بێی مژداری و پر دەلالات دنڤیسیت. هەڤوکێن وی یێن هەلبەستی دپر ڤاریبوون و هێماییێن بکار دئینیت پڕ بهێزن و دشێن دەربرینێ ژ کەلتورەکێ دەولەمەند و مرۆڤ دوستی بکەن. دەما من گوهدێریا هەلبەستێن وی دکر من یەکسەر دگەل خۆ وەردگێرانە سەر زمانێ کوردی. دهشێ من دا ئەتمۆسفێرەك دروست دبوو و دگەل هێماییێن وی بەر ب ئاسۆیەکی دی دچووم، و لگەل ریتما نێڤخۆیی یا وان هەلبەستا من هەست دکر کو ریتوال د گوهرینەك دوومدار دایە، هەلبەستڤان شیا ب رێکا هێما و جەڤەنگ و رستەییێن خۆ یێن هەلبەستی گوهداری بکەتە پشکەك ژ ڤی گەردونا پر پارچە (گومان، پرسیار و ئاشوب) یا هەلبەستڤانی ژ مەڕا نیگار دکر. هنەك جاران ژی گوهدێر یان وەرگر دکاریت ب بیتە گەرۆکەکێ ئازاد و (ئەڤرەك لسەر وەغەرێ)، هنەك جاران ژی دێ هەست کەت کو شوناس و ناسنامە بۆ مرۆڤی نە دپێدڤینە، بەلکو دهەمان دەمدا ژی دەنگەگ نخافتی و نەپەن دناخێ وی دا سەرهەلددەت و دبێژیت: خوزی ئەز شیابام من ئەڤ ناسنامەیا ئەز پێڤە گرێدای دراندبا. چونکە بۆ من دل رەقی و دوو دلیێ دروست دکەت، جاران ژی هەیە ناسنامە و پابەندبوون وپێگیری دبنە ئەگەرا دروستبونا توندکاری و توندرەوییێ، دهەمان دەم دا ئازادیا مرۆڤی پێشێل دکەن و زمان

وەكو ئامرازەكێ سرۆشتی كو مرۆڤ دەربرینێ ژ خۆ، ئازادی و پرۆژەیێ خۆ بكەت، زیندانی دبیت.

ئەلفەقیر د هەلبەستێن خۆ دا گەلەگ هزر و دید و بۆچوونا ب ئاوایەكێ ئەستاتیكی و جوان ئاراستە دكەت، لێ رێژەیا هەرە زۆر دهێلیتە هەلاویستی، ئانكو دناڤبەرا رستە و رێزان دا یان ل پشت و دناڤ پەیڤان دا ڤالاتیەكێ دهێلیت، ژبلی ڤێ چەندێ كو ئەڤە فاكتەرەكە ژ بۆ پتر جوانكرنا پێكهاتا هەلبەستێ و دیسان مە دئێخیتە هەمبەر هندەك ئەركێن نوی، و مرۆڤێ ئازادە چەوا دێ وان ڤالاتیا تژی بكەت، خوینەدەڤان دێ كاریت ب هێسانی ژ وی وەكو دانەر دوور بكەڤیت، وێ چەندی رەت دكەت كو خۆ بكەتە سەنتەر و ئەم وەكو خۆندەڤان یان وەرگر لدۆر وی بزڤرین، مرنا خۆ وەكو دانەر رادگەهینیت دا ئەم نەكەڤینە ژێر دەسهەلاتا وی، ئازادییەكێ ژ مەرا دبەخشینیت، لێ ئازادییەكا مەرجدارە، ئازادی د هوندورێ وان تێكستان دا بەرجەستە دەبیت، لێ رێكێ نادەتە مە كو ئەم ئەوێ دی بكوژین یان رەش بكەین، یان هەتا كرێت بكەین.. وێ رێكێ ل هەمبەر مە دگریت كە ئەم روناهی و جوانیێ تیرور بكەین، لڤر ئازادیا وی یا ڤەگرێدایە ب ئازادییا مەڤە، ئازادیا مە ژی ب ئازادیا ئەوی دی هاتیە گرێدان. لێ دیارە تانها مرۆڤ بەروڤاژی ژ تێگەهێ ئازادیێ تێگەهشتیە، لەوما ژی هەلبەستڤان د نڤیسینەكا خۆ دە دبێژیت:

(هێــشتا زوی بــوو مــرۆڤ ب ئــازادی ژ دایــك ب بیــت). ئــازادی بەرپرسـیارەتی یـە، هـێش جڤـاکێن مرۆڤینــی نەگەهـشتینە ئاسـتێ گەهیبوونێ کو بکارن ژ ئازادیێ و بەرپرسیارەتیێ بگەهن. مرۆڤ هەتا مرۆڤە دێ هەر یێ ب پێنەگەهشت یە چەنکە نەشێت خـۆ ژ بارگرانیـا تشتێن مادی رزگار بکەت.

هەلبەستڤان ب دیدەکا رەخنەگرانە ل بهایێن مۆدێرنێتـە دنێریـت، ل بەریا هەمیان جارناما مافێ مرۆڤـ، لێ نە ب دیدەکا سـەلەفی، بـەلکو ب رەهەندەکا دی کو دکارم بێژم دکەڤیتە پشتی ڤێ قوناخێ. وەهـا دبینیـت کـو ئـەڤ بـەها و تێگەهـە (دیموکراسـیەت و مـافێ مرۆڤــ و پلـۆرالیزم و ...هتـد) کـو بوینـە لۆژیکـا ئـەڤی سـەردەمی یـێن پـر کێماسینە و نەشێن قەیرانێن من و ئەوی دی چارەسـەر بکـەت، ئەڤـ لۆژیکە ژی مینا ئایدۆلۆژیێن بەرێ دێ شکەستێ ئینن، ئەڤ گێلەشۆکا ئیرۆ جیهانیگیریێ و بازاریێ ئازاد دروست کـری، ئـەڤ تێگـەهـ و بهایـە کرێت کرینە..

دنێڤ وان دەقا دا ل ژیانا بازێری بێزارییەك بەرچاڤ دبیـنم یـان ژی هەلبەستڤان د دودلیەکێ دا دژیت، لێ لپەی دیدا وی ئەلتەرناتیڤ نە گوند ، چونکە گوند قوناغەك دەرباز و بوری یە و نابیت ڤەگەریان بۆ تێگـەهـ و جهـێن بـەرێ هــەبیت، چـونکە پێڤاژۆیـا دیرۆکـێ و دانـێن بازێرڤانیێ ڤێ چەندێ قەبول ناکەن، ئەڤـ دیـدە ژی بـەروڤاژیا دیـدا

هنەك هەلبەستڤانێن رومانسی یە كو دبین بتەنیێ د گوندی دا ریتـوال و ئەتمۆسـفورێن رومانـسی دەسـت دكـەڤن، بـەلكو ئەلفـەقیرێ هەلبەستڤان د تێكستێن خۆ دا كار دكـەت ژ بـۆی جارەكا دی بـاژێر بێتە رێكخستن و بكاریت پتر دیـاردەیێن جـوان و قەشـەنگ و نـازك و پەیوەنـدییێن مـرۆڤینی ئـەوێن جڤـاكی ژ دەسـت دایـن د قوناغـا مۆدێرنێتیێ دا، پێدڤیە جارەك دن بـاژێر هـەمبێز بكەتەڤـە چـونكە ب وندا بونا بهاییێن هەنیێ، مرۆڤـ دێ پتر هەست ب هاڤیبون و دوو دلیـێ كەت.

پەیوەندی

ئەی با

تە ب دەستمالا خۆ یا نازك

رۆندكێن من زوها كرن

تە ئەز نڤاندنم

ئەی با

من ژ بۆ تە دەرگەهـ و پەنجەركێن خۆ ڤەكرن

ئەی با

شەمالكێن من نە ڤەمرینە

خۆندەڤان نەشێت ب ساناهی لسەر ڤێ کۆپلێ ببۆریت، پێدڤی ب راوەستانەکێ هەیە، چونکە تێکست بخۆ گوتارەکا راستەوخۆ نینە، بەلکو هەر پەیڤەك وەکو هێمایەکا پر رامان هاتیە بکار ئینان، جەڤەنگێن وێ ب شارەزایی هاتینە هەلبژارتن و د جهێن پێدڤی دا هاتینە دانان، ژ بۆی کو پتر رامانا بهەلگریت و و رۆلێ خۆ د ئاڤاهیێن تێکستێ دا بلەیزینیت و د پرۆسێسا ڤەکرنا تێکستێ دا بکاریت چەند خویندنێن جودا هەمبێز بکەت.

دڤێ تێکستێ دا، هن هێما و جەڤەنگ هەنە ژ وانا ( با، رۆندك، دەرگەه، پەنجەرە، شەمال و ...هتد). هەر یەك ژ وانا ژ رامانێن خۆ یێن کەهی و دووبارە دەرکەفتینە، دیمەنەك بێ هودەیی بەرچاڤ دبیت، گوهرینا شێوازێ تێکەلیا دنێڤبەرا وان فاکتەران دا ژ دژبەریێ بەر ب ئاشتبوونەڤێ و هەڤ سۆزیێ دبەت و ل ڤێرێ بیاڤا تەنگژینێ ( مسافه التوتر) دروست دبیت، ئەڤ ژی ب رێکا دروست بوونا ڤاریێ بوونێ د رستەیان دا. ئەڤ ڤاریێ بوونە وەها ل تێکستێ دکەت کو هەمبێزا چەند (بەلکی) یانکو ئیحتیمالاتان بکەت.

یەك ژ خویندنا یان ڤەکرنا هێمایا ئەڤ بەلکی یە یە.

با: گوهرین

پەنجەرە، دەرگەھ: ئەگەر دا ئێخستی بن: جڤاکێن قەدەر و پاشكەفتی . ب ڤەكرنا وان پێشوازیكرنە ژ دانێن نوی و قەبولكرنا گورانكاریان و دایەلوگ دگەل ئەویٚ دی.

رۆندك: گرفت و ئازار و جەنگ و كارەسات و مەینەتی.

شەمال: هێڤی و ئومێد و روناهی

دەما داخوازیٚ ژ بای دكەت، ڤێریٚ ڤاریٚ بوون دروست دبیت، پەیوەندی دنێڤبەرا با و شەمالكیٚ دا ژ جیاتی پەیوەندیەكا هەڤدژ بیت، هەول ددەت كو هەڤجوتیەك دنێڤبەرا وان دا بكەت.

یان ب گوتنەك دن، ئەڤ هەلبەستە یا ب بانگەوازیٚ دەست پیٚ دكەت، تێدا پەیامەك هەیە كو ئەو دیٚ پێشوازیا هەر گوهرینەكیٚ كەت، لیٚ ئەڤ گوهرینە دڤێت یا هەڤجووت بیت لگەل هێڤی و ئومێدێن وی.

با : دهێت وەكو هێما ژبۆ هێزداریێ و گەلەك هەلبەستڤانان ئەڤ هێمایە بكار ئینایە ژبۆ ڤیٚ مەرەمیٚ چونكی با دكاریت بەربەستێن مەزن بهەرفینیت و رێكیٚ ل هەمبەر خۆ ڤەبكەت و هەر وەها بای چ جهێن دەست نیشانكری نینە و دزڤرینەك دوومدار دایە و لسەر هەموو لایەن و ئاراستەیان بەلاڤ دبیت، دیسان با دهێت وەكوو هێمایەك دژبەریا نەگۆری بیٚ.

**ئەڤرەك لسەر وەغەریٚ:**

کۆمــەکا هەلبەســتێن هەلبەســتڤانێ عێراقــی – دانیمــارکی مــونعم ئەلفــەقیرە کــو ب زمــانێ عــەرەبی هاتیــە نڤیــساندن و بــۆ زمــانی نەرویژی هاتیە وەرگێران.

مــە گــوت هەلبەســتڤانی عێراقــی – دانیمــارکی، دکــارم هــەر ناسنامەیەکا دی بدەمێ، چونکە ئەڤ هەلبەستڤانە ب دید و پرۆژەیــێ خــۆ یــێ هــزری و ئــامرازێن خــۆ یــێن هەلبەســتی ڤــە نــە بەرهــەمێ کــەلتورەکێ دەستنیــشانکری و ڤــەبرە، بــەلکو تەڤــ کــەلتورێن ڤــێ جیهانێ کارتێکرنا خۆ کریــە ســەر پێکهاتــەیا وی و وەهــا لێکریــە کــو دناڤبەرا وان کەلتورێن جیاواز دا ب بیتە ستوونەکا هەڤپشك، هنــەك جــاران ژی ل بــازنێ جیهــانێ ژی ددەت و مــە بــەر ب ئاســۆیەکێ بــێ دوماهیك دبەت، دیار دکەت کو ئەڤ جیهانــە، ئــەڤ عــەردێ ئــەم لــسەر دژین، مێشکێ مرۆڤی سنووردار دکەت، ب رامانەکا دی دیار دکەت کو ئەڤ جیهانە تێرا خواست و خەونێن وی ناکــەت، پێدڤیــە مــرۆڤ هــەول بدەت خۆ نێزیکێ تشتەك بلند و بەرزتر بکەت، ب مــەرەکا هــەڤگرتن و هەتا رادەیــێ بوهــشتنێ دنــێڤ ڤــی بــازنێ بــێ دومــاهی دا. گوتــارا هەلبەستڤانی زۆر یا نێزیکە ژ گوتارا سۆفینزمی. لێ نە ب پێناســە و تێگەهێ وێ یێ ئایینی ڤە، بەلکو ب رەهەندێ وێ یێ مرۆڤینی ڤە، و دیارە کو رێبازا سۆفینزمی زۆر کارتێکرن کریە سەر عەقل و کەسینی یــا وی، ژبــەر ڤــێ چــەندێ ژی دبیــت پاشــناڤێ خــۆ ب ئەلفــەقیر

دایەناسین. هەر وەکو خۆیا یە ژ کەڤن وەرە صوفیان حەز ژ ڤان جۆرە ناڤان کری یە..

وندابوونا ئەندامان

ئەزم ئێکانەترین پەیڤداریێ پەشیمانیێ پەیڤینا خۆ

ئەزم یێ بێ گازی هاتی

ئەزم یێ دپرسیت و

کەس ژ بلی من بەرسڤێ نادەت

ئەوێن من گوتی

دێ دگوهێن بای دا کوم کەم

ئەز میهڤانێ روحا خۆ مە

ئەوا چ جەستەیا نە حەواندی

من بەژنا خۆ بۆ چەماندنێ بەرهەڤ نەکری یە و

پێ بێن خۆ ژی ژبۆ رەڤینێ

من جەستە بۆ رۆحا سەرگۆمکری نە هەلبژارتی یە

ئەوی دێمێ من نە بینیت

من نابینیت و ئەوێ من

ناس نەکەت

گازی من ناکەت

((ئەز دویر نەکەفتیمە چما دەنگێ خۆ بلند دکەی
تۆ ئەوێ گازی من دکەی))

لڤێرە نێرینەك سوفینیزمی دنێڤ ڤان رستەیان دا تێ دیتن، چەوا مرۆڤێ سوفی خۆ ل نیزیك هەر هەبوونداەرکی دبینیت.. چەوا هەول ددەت کو هەڤگرتنێ لگەل پایەداریێ بکەت و لڤێرە لپەی دیدا هەلبەستڤانی ئەو پایەداری مرۆڤە. هەلبەستڤان وەکوو مرۆڤەکێ دلپاك و دویر ژ هەر دل رەقی و کەرب و کینێ، یێ ئامادەیە دەستێ هاریکاریێ بۆ هەرکەسەکی درێژ بکەت نەمازە ئەوێ نە نیاسیت..

ئەڤرەك لسەر وەغەرێ

یان هەر تایتل و ناڤ و نیشانەکا دی، دبیتە کلیل و هنەك دەرگەهێن دایێخستی ل هەمبەر خویندەڤانی ڤەدکەت، لێ هنەك جاران ژی تایتل تەڤایا تێکستێن کۆمەکێ د یەك رستەدا خەست دکەت، دبینم کو ئەڤ تایتلێ سەری، خۆندەڤانی بەرەڤ دیمەنەکێ لڤۆك و بێ رەهـ و ریشال و پر گوهرین دبەت، هاڤیبوون و یاخیبوونا هەلبستڤانی دڤێ رستەیێ دا بەرجەستە دبیت، و پتر بابەندبوونا خۆ نە بتەنێ بۆ جیهانێ و مرۆڤی ، بەلکو دکارم بێژم پابەندبوونا خۆ یا گەردوونی نیشان ددەت. نها ڤی تایتلێ ڤەدخوینم کو هەلبەستڤان چەوا یێ یاخی یە لسەر سیستەمێ خۆ یێ جڤاکیێ کەڤن، دیسان

یاخی و بێزارە ژ جڤاکێ خۆ یێ نوی دا، دیار دبیت کو د هاڤیبوونەکا دۆمدار دایە. یاخی یە لسەر تەڤایا هزر و میتۆد و پرۆژەکتێن زال، ئەوێن هیڤی و ئومێد و خەون و جو ىێ تیرۆر دکەن:

**دەڤێ من ناکەنە زیندان**

**هەتا هەتایێ**

**زمانێ من تێدا بژیت**

هەلبەستێن ئەلفەقیری بارکرینە ب خەمەکا گران . خەمەکێ مرۆڤینی یا پان و بەرین، خەمەکا مرۆڤەکێ دوو دل و پرگوما پر پرسیار، وەها دبینم کو ئەڤ هەلبەستڤانە گومانێ ل هەر تشتەکی دکەت، نە بتەنێ گومانێ ل دان و تشتان دکەت، بەلکو هەتا گوما ل ئاستێ ئاگابوونێ دکەت. دبینیت کو ئەم د جیهانەکێ دا دژین کو هەر تشتەك دڤێ جیهانێ دا، د بیردانگا مە یا گشتی دا ژ هێلا حو یا دروست ڤارێ بوویە، لەوما ژی دبێژیت دیرۆکا جڤاکێ مرۆڤینیێ تانها قوناغەك ئازاد ب خۆڤە نەدیتیە، دەما ئەم لدۆر ئازادیێ دپەیڤین، ئەم لدۆر دیاردەیەکێ دئاخڤین تانها کەسێ نەدیتە و تاکە کەس تێدا نە ژیایە، و ئازادی د جیهانێ دە نەهاتیە پەیرەوکرن. لی هەلبەستڤان وەها نە یێ رەشبینە و هەر دەم شەمالەکی ب هەلکری دهێلیت و ئومێدەکێ دناڤ مەدا دچینیت، و ژ مەرا دبێژیت کو ئەڤە

وێ چەندێ راناگەهینیت کو ئەم دەستان ژ ئازادیێ بەردەین، یانکو ئەم ب جیهانەك بێ ئازادی و نەیەکسان و بێ دادوەری قایل ببین، بەلکو پێدڤیە هەردەم خەونێ ب ئازادی و جوانیێ ب بینن، و کارەکێ رژد و بەربەلاڤ ژێرا بکەین:

سەلیما

د سر و سەرمایێ دا ئاگری تینیت

د گەرمێ دا بەفرێ تینیت

د پەژارەیێ دا بتەنێ دمێت

د شادیێ دا هەمیان تینیت.

دڤێ کۆپلەیا هەلبستێ دا، هەلبەستڤان تابلۆیەکا شێوەکاری ب پەیڤێن خۆ دروست دکەت، تێدا سوفیگەری یەکا داپۆشی ب تێنەکا رومانسی و ب تامەکا گەردوونی خۆیا دبیت، ئەگەر پتر لدۆر تێگەهێ ئازادیێ ب پەیڤین، دبێژین کو ئازادی لڤێرێ تێ پێناسەکرن کو رزگار بوونە ژ تەڤ رامانێن خۆ پەرستنێ. ئازادیا تە گرێدایە ب شادی و بەختەوەریا ئەوی دیڤە و دەما کو هەست ب بەختەوەریێ بکەت، دەما کو شادی د چاڤێن ئەوێ دی دا جێگیر ببیت ل وی دەمی تۆ ئازاد دبیت . سوفیگەر وەها تەماشەی خۆشی و چێژی دکەن دبینن کو پیڤەرێ مرۆڤی بوونا مرۆڤی ئەوە مرۆڤ خەمخورێ ئەوێن دی بیت، هەستێ ب بەرپرسیارەتیێ بکەت و ئازارا مرۆڤ

تویش دبیتیّ دەما ئەركێن خۆ بەرمبەر وان بجه دئینیت، ئازارەكا خۆش و پڕ چێژە.

**سەلیما**... دبیت دایكا هەلبەستڤانیّ بیت، یان ژی هەر ژنەكا دی، كو هەردەم یا بەرهەڤە قوربانییّ بدەت، گیان و خوشی و بەرژەوەندیێن خۆ بیّ بەرامبەر بكەتە قوربانی ،هەروەها دبیت بتەنیّ ئەڤ ربە د ئاشۆپا وی دا هەبیت و وەكو دەمامك بكار ئینابیت، ئەو دەنگڤەدانا هزر و دیدی و خۆزیێن وی بیت، ب رێكا ڤان خازەیا دا ( الاستعارات) شیایە ئەتمۆسفێرەكیّ رۆمانتیكی بخولقینیت، كو تێدا پرۆژەیەكی دی یێ جڤاكی و مرۆڤی پێشنیار دكەت كە تێدا جهیّ تۆلەستاندنێ نەبیت.

بگوتنەك دی ئەو هێمایێن هاتینە بكارئینان د رویت و ئەبستراكت نینە ژ ترانسفێران (الاحالات)، بەلكو دەربرینیّ ژ ئەزمونی و كەتواریّ وی یێ دەرونی وسوسیولوژی دكەن.

د هەلبەستەكا دی دا، **(چاڤەریّ بوون)** ب هەمان دید، پرۆژەییّ خۆ ددەت كو تێدا دبێژیت:

**چاخیّ دەمژمێرەك**

**دوو دەمژمێر**

**لسەر چاڤەریّ بوونا وی بوورین**

و نەهاتی

هێلا رویێ وی هێدی هێدی بگەهیتە تەختێ

رونشتنێ و

گوت:

– ئەرێ ئەی تەخت دێ کارم

سوبەهی ل هەمان جه تە ب بینم؟

ئەگەر ئەم بنێرینە ڤێ تێکستێ، دیار دبیت ل دەستپێکی بۆ مە بوویەرەکێ ڤەدگێریت، لێ ڤاریبوون د ناڤەندێ دا سەر هەلددەت، دەما دهێلیت روویێ وی بگەهیتە تەختێ رونشتنێ و پرسیارێ ژێ بکەت، ل ڤێرێ ئەگەر پرسیارا خۆ ئاراستەی گیانەوەرکی کربا، دابیتە رستەیەکا کەهی و نەهەلبەستی، لێ تەخت وەکو تشتەکێ نەلڤ و بڤێ نەرمیێ سەرەدەریێ دگەل دکەت، تێن و هێزەکا دی ددەتە هەر تشتەك دی، نە ب تەنێ تەخت، بەلکو تەخت ل ڤێرێ هێمایەکا خوازیە (رمز مجازي) و هەلبەستڤان شیایە لبەر چاڤێن مە بکەتە تشتەکێ ب روح (و ب شیانێن پەیڤان). هەر تشتەکێ بێ روح روحدار بکەت و لڤێرێ لوتکا سینگ فرەهیێ و تولەرانتیەتیێ بەرجەستە دبیت، دەما ئەو دیالۆگێ دگەل ڤێ تشتێ نەلڤ دکەت و گەلەك ب دلەکێ خۆش، پشتی چەند دەمژمێرێن چاڤەرێ بوونێ دبوورن بێ ئەنجام (و نەهاتی) دبێژیت سوبەهی ژی هەر دێ هێتە

هەمان جه و دێ هەر چاڤەرێ بيت و چ گازندەيەكێ ل وی كەسی ناكەت كو نەهاتيە، بەلكو بێی كو گوهداريا وی بكەت و سەر هەلی وان ئەگەران بيت كو بوونە سەدەمێ نەهاتنا وی، لێ دبووريت..

ئەو يێ دگومانێ دا كو دبيت سوبەهی تەخت ل جهێ خۆ نە مينيت و بێزار ب بيت چونكە ئەو تا رادەيێ باوەريبوونێ يێ دلنيا يە كو سوبەهی ئەو هەر دێ هێت و هەتا هەتا دێ د حالەتێ چاڤەرێبوونێ دا بيت، چاڤەرێبوون فاكتەرەكێ هەرە مەزنە ژبۆی كو مرۆڤ بكاريت هە مەر كارەسات و مەينەتيان راوەستيت، چاڤەرێبوون ستوونەكا گرنگ و مەزنە دپروسيسا بەردەواميا ژيانێ دا.

هەلبەستڤان ب رێيا دروستكرنا پەيوەنديێن نوی دناڤبەرا تشتان دا (مرۆڤ / تەخت) شيايە ڤاريبوونێ د رستەيان دا دروست بكەت و بێی مژداريەكا دەستكرد، بكارئينانا هێمايێن پر دەلالات شيايە بويەرەكا ئاسايی بكەتە پرسيارەكا مەزن.. و هەروەها پرسيارێن هان يێن هشك نەبن، بەلكو پرسيار و ناڤەرۆك و رەهەند ب بەرگەكێ رومانسی دپێچايی بن.

تێ تێبينی كرن كو د پرانيا هەلبەستان دا، دەم بەر ب ئايندەيەكێ ڤەكری و چ ڤەگەرەك يان ئاڤريدانەك بۆ رابردووی نينە. بەلكو هەردەم رابردوو (يێ تال) تێ لادان، هەول ددەت كە ئەم ئەزمونێن بەرێ د هشێ خۆ دا تيرۆر بكەين و بيردانكا خۆ ژ تێكەهێن دل

ەقیێ ڤالا بکەین ئەو ڤەگەر کو د زمانێ سینەمایێ دبێژنێ (فلاش باك).

هەلبەستڤان د هەڤرکیا دناڤبەرا ئاینده و رابردووی دا یێ بێ لایەن نینه بەلکو پێشبینیا ئایندەیەکا زەلال و گەش و پر خەون دکەت، کو ـتر د تێکستا دەمژمێر دوازده دا دیار دبیت:

ها ئەڤە دەمژمێر دوازدەیە

دیوارێن ژوورێ بەرەف من دهێن و

من تشتەك نینە

ها ئەڤە دەمژمێر دوازدەیە

دار یێن دخەوەکا گران دا و

تاریی یا باخچەی

ـەو ستێرا رژیای ڤەگرت

ها ئەڤە دەمژمێر دوازدەیە

دوست دنێڤ دارستانا بیردانکێ دا

وەـدا دبن و

ون ژی ل دووری من پەیاسا دکەن

ها ئەڤە دەمژمێر دوازدەیە

چاڤەرێی کەسەکی دکەم

نە چاڤەرێ کەسەکی دکەم

دەستێ من لسەر رویێ من دخەو چوو

خەونێن خۆ یێن رند هەلدگرم و

دچم درازم

دێ چ مرۆڤ بم ئەز

ئەوا ئەز چێژێ ژێ دبینم

ئەز خەونێن خۆ دچنم

خەون ..خەون ژدارا خەوێ

ئەگەر ئەم لسەر هنەك جەڤەنگ و سیمبولێن ئەڤێ هەلبەستێ راوەستین دێ بێژین:

دەمژمێر دوازدەیە: دەستپێکا رۆژەکا نوی چونکە تەڤ هێما یێن هاتینە بکارئینان ئاماژێ ب شەڤێ دکەن( ستێر، تاری یا باخچەی، خەو و نڤستن..)

دوست: بیرهاتن، بووری

خەون: هیڤی و ئومێد و ئایندە

ئەو(کەسایەتی یا ڤەگێر): سەنتەر یان ناڤەند دناڤ دا تەڤ پێکهاتیێن دی دگەهنە هەڤدوو.. یان دنێڤ دا دبهوژن وەك سوفیەکێ پڕ عەشق، ئەڤ سوفی یە ل گەردوونەکی دگەرێت کو دنێڤبەرا هەڤدژان

دا یەككگرتنـەكێ دروسـت بكـەت، (سـتێر / تـاری) دەمـا تـاری یـا باخچەی ستێرا رژیایی ڤەدگریت.

مـە لـدۆر تـایتلێ گـوت كـو گەلـەك جـاران دبیتـە كلیـل، لێ پرانیـا هەلبەستێن ئەلفەڤیری دبـێ تـایتلن، چـونكە د وێ بـاوەرێ دایـە كـو دانانا تایتلی خیانەتە ژ روحا تێكستێ، لـێ دهـەمان دە نەشـیایە تـا داویێ خۆ ژ ڤێ لاسایی كرنێ (دانانا تایتلێ) قورتال بكـەت. لـەوما ژ بۆ هنەك هەلبەستێن خۆ تایتل دانانە. ئەگەر هەلبەستا ژێر تـایتلێ "سەرباز" وەربگرین:

سەرباز

نەیێ خلولە بوو تا شكەستنێ

نەیێ نەرم بوو تا پێچانێ

د تەنیایی یەكا نامۆ دا مەلەڤانیا دكەت

د مۆلەتا خۆ یا یێكێ دا:

ب پارهەلگرێ هاتەڤە

د مۆلەتا دویێ دا

ب پاسێ هاتەڤە

د مولەتا سێ یێ دا

د سندریكێ دا هاتەڤە

دێ بێژین ئەگەر ئەڤ تایتلە ژێرا نەدانابا، تێکستا هەنێ داکاریت پتر پرسیاران دروست بکەت. لێ ئەگەر تایتل نەبا دا پتر لدۆر وی کەسی پرسیار دروست بن و گەنگەشە د مەژیێ مرۆڤی دا پتر داهێتە ئاراندن.

لێ دەمەمان دەم دا لدۆر کەس و جە و بوویەرێ، هەلبەستڤان شیایە ب دەنگەکی بلند دگەل خۆ دیالۆگێ بکەت یان مۆنۆلۆژەکا نێڤخۆ دروست دکەت، د دیمەنەکێ هەلبەستیێ خەست و کورت و ڤەبر دا.

ئەگەر تێگەهـ ب ساناهی خۆ ب دەستڤە نەدەت " السهل الممتنع" وەها پێناسە بکەین کو ئەو رستە و پەیڤێن کو دەما خوێندەڤان ڤەدخوینیت، هزر بکەت کو ئەو ژی دێ کاریت مینا وان بنیڤیست، لێ دەما دەست ب نڤیسینێ دکەت، ل وی دەمی بۆ ئاشکرا دبیت کو د شیانێن وی دا نینە تشتەکێ وەها بنڤیسیت.

هەرچەندە تا رادەیەکێ هەلبەستێن ئەلفەقیری دکەڤنە هەمان ستایل دا. لێ ئەوا هەلبەستێن وی ژ ڤێ ستایلی جودا دکەت، ڤارێبوونە کو ل داویێ د رستەیێن نەکەهی و یێن نە چاڤەرێکری ئەوێن ژ نشکاڤە لڤێرێ و وێرا هە خۆیا و بەرجەستە دبن.

هەروەها هەلبەستڤان وەکو ڤەگێر خۆ ل تێکستێ ڤەدەر دکەت، وێنەیێ هەلبەستی پال ددەت کو وێنە ب رۆلێ وی بلەیزیت، وێنە ب پەیڤن، ب زمانێ سینەمایی گرتەیێن پانتۆمایم ژ مەرا پێشکەش

دکەت، ئەڤ حالەتە ژی د هشێ وەرگری دا بەرجەستە دبیت، دەما پەیڤێ ژ رامانا وی یا فەرهەنگی دەر دئێخیت و ب رامانەکا مەجازی تێندار دکەت و ئەڤە ژی ڤەدگەرێت بۆ ئاستێ سەرەدەریکرنا هەلبەستڤانی دگەل زمانی دەما بکاریت فەرهەنگ و ئەزموونێن بەرێ دنێڤ خۆ دا تێرۆر بکەت و باکراوەندەکێ زەنگین پرۆژێ خۆ تێز بکەت.

**************

* گرێتە گوستبۆل: وەزیرا رەوشەنبیری یا بەرێ یا دانیمارك.

# بیردانكا نكراندی و..
# سوره برینا شه‌ڤا من

سوره برینا شه‌ڤا من

((چرایێ چاڤێن من

من ژ بیرنه‌كره،

هه‌تا ل بیر بینم !

شه‌ڤه‌ك به‌رهاڤێتی،

ژ پایزه‌كه سه‌ربه‌ردایی

فه‌رهه‌نگا خوینێ دهلمێسا.

تاڤسوركا گوندێ من،

خوه ژ نفرینا دپێچا .

گه‌ها ده‌رازینكا گوهێ من

بزدمبادانا روڤیا

روونی دره‌ڤی و ئاڤ بێ ده‌نگ دبوو.

گوندێ من ..
گوندێ من ژ كولانێت خوه دترسا
ئاشیپكێت سور شەڤا من دخوار
داپیرا من
ب دەنگەكێ بلند،
یاسین دهەژمارت
نوت و نەهـ بەرخشینكێت
كەس نە بینایی،
دكرنە بازیەند،
و ل زەندێ مە شداند.
قادر ژ ترسا خوه..
هەلاویست بوو.
ل ناڤ كوركێ نەبوونێ هەلیابوو
لسەر پێنگاڤا قورچێت مرنێ
پیر دبوون.
گوملەكێ من یێ سپی
گەفێن سپێدێ دكڤاشتن،
خوناڤ ژ چاڤێن ١١ نێرگزان ڤەخوار.
ژ لەرزا لحێفكا من درەڤی،
ئو تم من دكێشا،
ئەو ژی نەبوونا سیبەرا شەڤا من ،
پێستركێ چاڤێت من رەڤكرن.

من مژگولێت خوه،
لسه‌ر لولیا تڤه‌نگێ ،
لبو لبو دهه‌ژمارتن..
باروتێ ده‌نگێ زاروکا
وه‌کی دێمێ خوه لێکربوو
ژ ده‌نگێ هوڤێن دو پێ..
زه‌لام ژ مێرانیا خوه حاشا دبوون،
دایکا برینێنت گوندی هه‌مبێزدکرن؟
که‌ڤا ده‌ستێ فاتما نه‌بیا دشێلان
هێدی هێدی
گری و زێمار پێ ڤه‌دمالین
ب لێڤکا کورته‌کێت خوه برین و روندك
هاویش دکرن.
چرایێ چاڤێت من:
ما تو بێژی ژبیربکه‌م!؟
ئه‌و گه‌ودێ هه‌تا نها،
لناڤ مێژوویا مه‌ژیێ من ده
دلیزه. برینێت ساڤا ،
ژ که‌ربا قه‌ده‌را نیشانکری
من ژچاڤێن خوه مێهتن
ئه‌و گومله‌کێ ژ ره‌نگی گولنه‌خوینێ
یێك یێك من قولپکێت وێ هه‌ژاندن.

حەمايلوكێت خالى،
لسەر سينگا شەڕێ شەڤێ
چەوا بێهن ڤەدابوون!
ڤيريا من ژ كنفێ ئەيوب
لەخەرتر لێ هاتبوو..
كولانێت بازێڕكێ من،
مينا سەرێ سێڕيانا چوار چرا،
دەنگ ڤەدابوو..
خوەزى لسەر پەڕێت خوە يێت بريندار شين دبوون
ل وێ سپێدەيا ئەروتيك
ئەسمانێ گوندێ من
سوركرن و چاڤێن خۆ ل مە زلكرن
ب شەهمەزاريا خوە
ئەم ل هەمبێزا خوە هاژوتن))
سەلوا گولى / سويد

دەما من هەلبەستا (سورە برينا شەڤا من ) يا هەلبەستڤان سەلوايا گولى خاندى، بەرى يا هەرتشتەكى من هەستكر كو دهەر رستەيەكێ دا هەلبەستڤان يا بۆ مە ديروكەكێ ڤەدگێڕيت و يا زنجيرەكا رويدان و بويەران د رستەيێن خۆ دا خەست دكەت، هەر چەندە هنەك ژ وان رويدان و بويەران ئەزموونا وێ نە وەكە تاكە كەس، لێ وەها ل مرۆڤى دكەت كو ئەزموونەك گشتى يە و لسەر

مرۆڤی ژی را بووری یە و ب رستەیێن خۆ مرۆڤی تێکهەلی بویەران دکەت هەر وەك مرۆڤ تێدا ژیایە. ب رێکا رستەیێن هەلبەستێ، هەستێن مرۆڤی دگرنژینیت و هەرگاڤ مرۆڤی بەرەڤ سەنتەکێ دبەت بێی پیڤەر و نەخشەو پلان مینا کولانێن بێ ئەندازە دگوندەکێ رۆژهەلاتی دا. هەر ل دەستپێکێ، خویندەڤانی بەر ب شەڤەك پایزی و گوندەکێ کوردستانێ ڤە دبەت، مرۆڤی دادنێتە هەمبەر دیمەنەکێ تژی ترس، هێزێن داگیرکاران ب کلتورێ خۆ یێ بسەرداگرتن و مەرگدۆستی ورەشڤەکرنێ ڤە ، شەڤەکا رۆمانسی یا گوندەکێ کوردستانێ یێ بێ گونەه، گوندەکێ خۆ تافیلکری ژ تەڤ گونەهان شێواند..

(شەڤەك بەرهاڤێتی،
ژ پایزەکە سەریەردایی
فەرهەنگا خوینێ دهلمێسا.
تاڤسورکا گوندێ من،
خوە ژ نفرینا دپێچا .
گەها دەرازینکا گوهێ من
بزدمبادانا روڤیا)

ئەڤ هێزێن ئەهریمەنی دهێن و وێ سپەهیێ و ئەتمۆسفێرێ جوان و رند تێك ددەن، لێ ب زمانەك هەلبەستی، هەلبەستڤان ئەڤان رویدان و بویەران ڤەدگێریت .. دەما مرۆڤ دخوینیت گوهـ تژی دەنگێن پۆستالێن سەربازێن داگیرکاران و قیژی و هەوارێن پیر و کال

و زارۆیێن گوندەك ئارام دبن. دگەل دەنگێ تەقە و گوللەیان دفن تژی بێهنا مژا بارود و دەینامیتێ دبن، چاڤ دیمەنەك تراژیدی و دلتەزین دبینن و تژی هلما خەردەل و سیانیدێ دبن. كاروانێ خەلكێ سڤیل بەر سینگێ سەربازان تێ هاژوتن كو هەتا ئەسمان ژی خۆ هەمبەر وان تاوانا شەرمزار دبینیت. ئەڤ تراژیدیایە ب درێژاهییا شەڤەك پایزی ڤەدمینە و ل وێ سپێدەهیێ ل جهێ ب بیتە هێمایا نوبیبوونەڤا ژیانێ و دەستپێكرنا كاری و ژیارێ, بەروڤاژی دبیت و دبیتە تێبایەك بدرێژاهییا ژیێ خەلكێ گوندی دگەل وان دمینیت و ل ڤر هەلبەستڤان دخوازیت بێژیت كو ئەو شەڤ یا نكراندی یە د بیردانكا وێ دا هەرچەندە نها ل ئەورووپا ژیانێ دبەتە سەر و ژ جهێ رویدانێ دویر كەتی یە, لێ رویدان و دۆزا وێ یا نەتەوی ب گشتی هەر د هزر و بیردانكا وێ دا دلڤن و گرێدانەك موكوم دگەل رۆژانێن وێ هەیە ، تا رادەیەكی كو مرۆڤ دكاریت بێژیت كو د هندەك گاڤ و شەڤان دا ئەو تێبا سەرا وێ ددەت ، لێ ل جهێ ب بیتە پەتایەك دەروونی و سایكی, دبیتە هۆكارێ پتر ڤەگرێدانا وێ ب كەتوار و دۆزا وێ ڤە.

(ل وێ سپێدیا ئەروتیك
ئەسمانێ گوندێ من
سورکرن و چاڤێن خۆ ل مە زلكرن
ب شەهمەزاریا خوە
ئەم ل هەمبێزا خوە هاژوتن)

مه گوت هەلبەستڤان دڤیٚ هەلبەستیٚ دا، ئەزموونا خۆ ڤەدگیٚڕیت و شەڤەکا نکراندی د بیردانکا خۆ دا زیندی دکەتەڤە و لدوٚر مژارەکا ئاراندی د هشیٚ ویٚ دا دپەیڤیت و ئەرکەك پڕ قورسە هەلبەستڤان دەقا خۆ لسەر ڤەگیٚڕانیٚ ئاڤابکەت یانکو رویدانیٚ ڤەگیٚڕیت, لیٚ نە ب زمانیٚ سادەییٚ ڤەگیٚڕانیٚ بەلکو ب زمانەك هەلبەستکی ، ویٚ ئەزموونیٚ و وان بویەر و رویدانا ب رستەییٚن هەلبەستکی تیٚنداربکەت, و دڤیٚ بیاڤیٚ دا کورتکرنەڤیٚ روٚلەك گرنگ هەیە و ل پەی دیتنا من ویٚرەکی یا هەلبەستڤانیٚ د کورتکرنەڤیٚ دا خویا دبیت, چونکو ئەم لسەر کلتوریٚ تیٚر و تەسەلییٚ راهاتینە. لی دەما هەلبەستڤان کومەك یادگار و سەربور و هەستیٚت جودا جودا ب ڤەڕیٚژا وانڤە دنیٚك رستەدا کورت و خەست بکەت و سەرکەفتی بیت دڤی کاری دا، ل وی دەمی شەهرەزایی و ویٚرەکی یا هەلبەستڤانیٚ خوٚیا دبیت.

(گوندیٚ من ژ کولانیٚت خوە دترسا
ئاشیپکیٚت سور شەڤا من دخوار
داپیرا من
ب دەنگەکیٚ بلند،
یاسین دهەژمارت)

دڤیٚ کوٚپلەییٚ دا، هەلبەستڤان ب ئاوایەکیٚ ستیٚتیکی دیمەنەك مەترسیدار مینا گرتەیەکا سینەمایی یا تژی ژ سەهم و سافیٚ و ئامازەیان نیشا ددەت و ب یاریەکا زمانەڤانی دیزاینەکا هونەری بەرجەستە دکەت.. کولانیٚن گوندی وەها دهیٚنە بەرچاڤان کو

کەسەا تێدا نیە و کولان ب خوە یا چاڤەرێی رویدانەك مەترسیدارە
هەرحەندە مرۆڤ نها یێ دویرە ل جهێ رویدانێ، لێ مرۆڤ هەست دکەت کو ئەو جە یێ دلڤیت و بەرەڤ مرۆڤی ڤە تێت و لڤێرێ هێزداری یا دروستکرنا وێنێ هەلبەستێ خویا دبیت. دڤێ کوپلا سەری دا هند ڤارێبوون هەنە مینا (داپیرا من/ ب دەنگەك بلند/ **یاسین دهەژمارت)**

یاسین بخو وەکو سورەتەك قورئانی تێتە خویندن، لێ ل ڤێرێ هەلبەستڤان دبێژیت کو ترس یا گەهشتی یە لوتکێ و هەر تشت بەروڤاژیکریە و دیسان تێنەك پڕ مەزن دایە پەیڤان و رستەیەك هەلبەستکی و ڤارێبوون دروست کری یە و زمان ژ زمانێ ڤەگێرانێ و گوتنێ جودا کری یە .. ئەگەر هەلبەستڤانێ گوتبا (داپیرا من ب دەنگەکێ بلند یاسین دخواند)، دا بیتە رستەیەکا سادە و نە هەلبەستکی، یان دەما دبێژیت (گوندێ من / ژکولانێت خوە دترسا) ڤری تشتەکێ بێ روح و نەلڤ، روحتەبەر دبیت و دپەیڤیت و ...رهابیین خو بۆ مە ڤەدگێریت ، هەلبەستڤان مە دئێخیتە هوندری لوتکەیا نەبرانەك خوینەلۆ و پرسگریەك ئالز و پڕ ترس و دوو دلی ، مینا چەندین رستەیێن دی کو مرۆڤ دکاریت هەر دخویندنا ئێکێ دا سەرهەلی وان ب بیت مینا:

**( ژ لەرزا لحێفکا من درەڤی**

**ئو تم من دکێشا)**

دهەلبەسنی د ، رامان دپەیڤێ دا نینە بەلکو د چەوانی یا ب کارئند ما رستەیێ دا مینا ئەو رستەیێن سەری دیار و دڤی رستێ دا:

( روونی دڕەڤی و ئاڤ بێ دەنگ دبوو)

بەری یا ئەڤ هەردوو پەیڤە ( روونی) ، (دڕەڤی) دڤێ رستێ دا بێنە بکار ئینان، هەر ئێك ژوانا رامانا خۆ یا فەرهەنگی هەبوویە، لێ دەما ئەڤ هەردوو پەیڤە دنێك رستەدا گەهشتینە هەڤ، هەردوویان رامانا خۆ یا بەرێ ژ دەستدا یان هەردوو رامانا ئێك گرت داکو ب هەڤڕا رامانا سێ یێ دروست بکەن و هندەك دەلالاتێن دی هەلبگرن.
ل پەی دیتنا من و ئەگەر ب زمانەك زانستی شروڤەبکەین دبێژین کو دنێڤبەرا واندا هەڤکێشەکا کیمیایی دروست دبیت مینا دوو مەتریالێن ژهەڤجودا کارلێکیێ (تفاعل) ل هەڤدوو بکەن و زمان و فەرهەنگا بەرین و بەرفرەهـ یا هەلبەستڤانێ و کویراتیا هزری و زیندیا ئاشوپ و وەستاکاریا وێ رۆل و فاکتەرەك خورت دبینن ، رۆلێ وێ وەکو فاکتەرێ هاریکار دهەڤکێشا کیمیایی دا دلەیزینن، یان ب گوتنەك دن ئەڤ هەڤکێشە بەرهەمێ زمان و فەرهەنگ و هزر و ئاشوپ و شەهرەزاییێ یە و بەری یا دروستبوونا ئەڤێ رستەیێ یان یا دی، دناخێ هەلبەستڤانێ دا ئەڤ هەڤکێشە هەبوویە وب بزاڤتن و چەلەنگییا زمانی هاتیە دەرئینان.

روونی دڕەڤی
ئاڤ بێ دەنگ دبوو

دوو جەمسەر هەنە (رووناهی/ تاریاتی) و دنیڤبەرا واندا هەڤڕکیەك دژوار و ئەزەلی هەیە، ئەڤێ هەڤڕکیێ بەرهەڤبوونا خوە یا هەمیشەیی هەیە دمێشك و عەقل و هزرێن مەدا ، هەر ژ کەڤن وەرە ئەو ئایینێن کوردا و مللەتێن دی باوەری پێ ئینابن بێن ئاڤاکری

بووینه لەسەر ڤیێ دوالیزمییێ و ژبەرکو ئایین بوویە برپرەیا چاندو کلتوورێ مە و پشکەك هەری بەرین دپێکهاتا مە یا هزری دا، مە تەڤ هزرێن خوە لسەر ڤیێ لوژیکا دوالیزمییێ دا بەش کرینە ، دەما روونی دپەڤیت وەها دگەهینیت کو هێزێن تاریاتییێ سەرکەفتن ب دەستڤە ئینایە ، و رستەیا ( ئاڤ بیێ دەنگ دبوو ) تێت داکو پتر گوتنا ئێکێ ب سەلمینیت، ئاڤ وەکو ئامرازەکێ پاککرن و شوشتنێ و تافیلکرنا گونەهان، و دەما ئاڤ بیێ دەنگ دەبیت، ئەڤە وێ چەندێ رادگەهینیت کو ئێدی هەمی تشتێن پاکژ دێ تۆزگرتی بن، و ئێدی هێزێن ئاڤاکار نکارن ب کارێ خوەیێ سروشتی رابن.

سورەبرینا شەڤا من، تایتەلێ ئەڤێ هەلبەستێ یە ئەوا ئەم لدۆر دپەیڤین، دبیت نێزیکیەك هەبیت دنێڤبەرا ڤی تایتلی و تایتلێ رۆمانا رۆماننڤیسێ تورك ئۆرهان پاموك (ناڤێ من سورە) لێ تایتلێ رۆمانا هان، روماننڤیسی ژ هونەرێ شێوەکاری یێ ئیسلامی وەرگرتی یە، کو رەنگێ سور دوی هونەری دا یێ زالە، لێ سەلوایا گولی ژ ترازیدیێن شورەشێن کوردستانێ و رویبارێن خوینێ یێن بەرخودان وبەرەڤانیکرنێ وەرگرتی یە و ئەم دزانین کو رەنگێ سور بەرهەڤبوونا خۆ د ئەدەب و چاندا کوردی دا هەیە و ئەڤ رەنگە یێ بوویە پشکەك بەرین و کاریگەر د هش و بیردانکا مە هەمییان دا.

دیسان ئەوا تێ بەرچاڤکرن دڤێ هەلبەستێ دا، کو جهێ سەرەکی و ئێکانە دڤێ هەلبەستێ دا گوندە" هەرچەندە هەلبەستڤان ئەڤە بۆ دەمێ چەندین سالایە د وەلاتەکێ پێشکەفتی و بازێرەکێ مودێرندا ژیانێ دبەتە سەر، لێ وەکو دیار گوندی هێشتا بەرهەڤبوونا خۆ یا

کاریگەر هەیە لسەر هشی ̌وێ و دبیت ئەڤێ چەندێ وەها لێکبدەینەڤە وەکو گەڕیانەك لدویڤ رەھ و ریشالان ، ل دیڤ ناسنامێ و ئەڤە د ئەدەبێ ئەمریکی دا دیاردەك بەرچاڤە و هەتا نها ژی ئەمریکی وەها تەماشەی ئەورووپا دکەن وەکو جهێ رەھ و ریشالێن وان و هەستەك سوزدار هەیە لجەم وان بۆ وی جهی.

مە گوت هەلبەستڤان یا ڤەگرێدایە ب گوندی ڤە و هەتا نها ژی دهەلبەستێن وێ دا دبینم کو ترسەك ددلێ وێ دا هەیە و ئەو ژی ترسا دابونەریتێن جڤاکی یە و دبینین ، دڤێ هەلبەستێ دا نەشیایە ب ئازادانە دەربڕینێ ژ دید و نێرینێن خۆ بکەت وەکو ژن، ل دەمێ رویدانێ دا ئەو کچەك سنێلە بوویە ، لێ نزانین دەنگڤەدانا ڤێ رویدانێ لسەر ناخێ وێ چ بوویە، بەلکو پتر دگەردوون و چارچویڤێ کۆمێ دا دژیت و هزر دکەت وەکو ئۆرگانێ وان دپەیڤیت .. ئەڤە ژی ئێکە ژ ساخلەتێن ئەدەبێ رۆژهەلاتی، دیسان مرۆڤ دێ کاریت وەها بو ب چیت کو هەلبەستڤان یا دنێڤبەرا ڤێ دووالیزمیێی دا (رۆژئاڤا/ کوردستان) د دوولیەك مەزندا دژیت، و ئەڤە ژی دنێڤبەرا رێزان و ل پشت وشەیاندا تێ بینین ، و دنیڤبەرا ڤان هەردوو جهێن جودا و کلتورێن جیاوازدا ، تنگژین و دوو دلی یا هەلّبەستڤانێ وەها لێ دکەت کو ل چ جهەکی یا دلئارام نەبیت ، بەلکو هەردەم دحالەتێ هاڤیبوونێ دا بژیت، ژ لایەکی ڤە یا ڤە گرێدایە ب وەلاتێ خوە یێ ئێکان ڤە ( کوردستان) و دهەمان دەمدا بها و هزرێن زال ، و دابونەرێتێن جڤاکەك دائێخستی رەت دکەتەڤە ، و یان پێ قایل نابیت و دهەمان دەمدا ناگونجیێت دگەل میتۆدا رۆژئاڤایی ، لەو ما

ژی هەست دکەت کو پێدڤی یە وێ ژی وەلاتێ خوە هەبیت، و ئەگەر هەلبەستڤان پتر خوە ماندی بکەت ڤێ هاڤیبوونا خوە ب ئاوایەك راستی ب کار بینیت، و ئەزموونا خوە دەولەمەند ، ب بەرفرەهکرنا فەرهەنگا خوە ، و پتر سەرهەلی هزر و ئەدەبێ جیهانی ببیت، دێ شیت هاڤیبوونا هەنێ ب ئاوایەك بەر فرەهتر مفای ژێ وەربگریت و کارەك جوان و رند تر بکەت.

مە گوت یا دیارە کو هەلبەستڤان یا ڤە گرێدایە ب ولاتێ خوە یێ ئێکان ڤە، نەمازە گوندێ ڤی ولاتی ڤە ، و دبینین کو تەڤایا هێما و کەس و جهێن دڤێ هەلبەستێ دا دەربرینێ ژ ژیانا گوندا دکەن و لەوما هەلبەستا خۆ پتر ب هێمایێن ئایینی و کلتوری (نفرین، یاسین، بازبەند،روڤی، هوڤ.، ئەیوب، فاتما نەبیا، گەودە.) تێندار و بارگە دکەت.

ژ دەنگێ هوڤێن دو پیێ..
زەلام ژ مێرانیا خوە حاشا دبوون،
دایکا برینێنت گوندی هەمبێزدکرن؟
کەڤا دەستێ فاتما نەبیا دشێلان
هێدی هێدی
گری و زێمار پێ ڤەدمالین..

ل ڤێرێ هەلبەستڤان گولی ب دیدەکا رەخنەگرانە تەماشەی تێکست و پێکهاتا جڤاکێ کوردی دکەت، و ب ئاوایەك ڤەشارتی و هونەری رەخنا خوە پراکتیزە دکەت، وەکە ژن رەخنێ ژ زەلامی دگریت و ژپیروزترین نرخ و بهایێن وی ددەت (مێرانی)، دەما زەلام

حاشاييێ ژ مێرانی یا خوه دکەت ، ئەڤە مەزنترین ملکەچبوونە بوٚ دەستهەلاتیێ یان ب گوتنەك زەلال تر بوٚ هێزێن داگیرکارو بیانی ، لێ بێی کو هێرشیێ بکەتە سەر وی یان دژایەتی یا رەگەزێ نێر بکەت ، بەلکو هەر ل دەستپێکیێ موبەڕپا بوٚ وی و ویێ حاشاکرنیێ ڤە دەبینیت(ژ دەنگیێ هوڤێن دو پیێ) لێ بەرانبەر ژی ژنیێ وەکە رەگەزەکیێ هێزدار و خودان هەلوێست ددەتە بەرچاڤکرن و دیار دکەت کو ددەمیێ تەنگاڤیادا ژن دکاریت رۆلەکیێ ئەکتیف ببینیت، دکاریت ب دلسوزی و دلۆڤانی یا خوه ڤالاتی یا زەلامی ب لاوازی یا خوه چێکری پڕ بکەتەڤە ، و هێزێن ڤەشارتی ئەوێن دنێڤا ویێ دا هەین ڤەژینیت و دەربێخیت و بکاربینیت ، نەمازە ددەمێن تەنگاڤیادا دەما زەلام ژکار دکەڤیت و کونترۆل ژ دەستیێ وی دا نەمینیت ، ژن دکاریت بە ئامرازێن خوه برینا سارێژ بکەت و بکاریێ بەرهەڤکرنا نەوەیەك نوی رابیت, کو ئەو نەوەیا نوی یا ئامادە بیت درێژاهییێ ب پێڤاژۆیا ژیان و ژیار و هەبوونیێ بدەت ، ئەڤەژی لەپەی ڤەخویندنا من دیاردەك ڤەگرێدایە ب جڤاکێن بابسالاری ڤە ، ئەو جڤاکێن د گاڤ و سەردەمێن ئارامییێ دا رۆلێ ژنیێ کێم دبینن یان ژی دژ بەری رۆلێ ویێ یێ جڤاکی دراوەستن و چ دەرفەتا بوٚ دابین ناکەن، لێ د دەمێن تەنگاڤیادا ، دەما کوٚنترۆلا پرۆسیسا رێڤەبرنیێ ژ دەستیێ زەلامی دەردکەڤیت ، ل وی دەمی دەرگەهـ هەمبەری شیان و هێزا رەگەزێ دی تێنە ڤەکرن چونکو ئێدی جڤاك و زەلام و هێزین دەستهەلاتدار نەشێن سانسۆرێن خوه بکار بینن:

**(دایکا**

**برینێت گوندی هەمبێزدکرن؟)**

دڤێ رستێ دا هەلبەستڤان ئەڤ هەمی گوتنێن مە و چەندین گوتنێن دی کو دکاریت هەلبگریت خەست کرینە و شیانەك مەزن و هێزدار دایە پەیڤێ و ژن دڤێ رستێدا بیرا مە ل رۆمانا ب ناڤودەنگ یا رۆماننڤیسێ رووسی "مەکسیم گۆرکی"( دایك) دئینێت ، هەرچەندە دبیت دایك (ژن) دویێ رۆمانێدا یا ئەکتیڤ و کاریگەرتر بیت دپرۆسیسا سیاسی دا و پتر یا رێکخستی بیت, لێ ژن یانکو دایك دڤێ هەلبەستێدا پتر مە رادکیشیت بەر ب جیهانا سینگفرەهی و بەرخودانەك ئاشتیانە ، بەرخودان نە ب رامانا کارئینانا توندوتیژی و تێندانا روحا تۆلڤەکرنێ ، بەلکو ب رامانا گەڕیان ل دویڤ جیهانەکا بێ قەیران و بەر ب بەلاڤکرن و بەرپاکرنا تێگەهـ و نرخێن ئێکسانی و مرۆڤدۆستێی وەها دایکێ دکەتە کانیەکا زەلال و ژبن نەهاتی و بەرهەمدار, و دفەرهەنگا وێ دا هەردەم پەیڤێن هیڤی و ئومێد و خۆبەخشکرن و لێبورین د خۆرت و بریقەدارن ، دڤێ هەلبەستێدا هەلبەستڤان وەها دیاردکەت کو ژن پیرۆزیا دکەتە ئامرازەك ژ بۆی بنبڕکرنا دیاردێن سەرداگرتن و توندوتیژی یێ ، بەروڤاژیا زەلامی کو بدریژاهی یا دیرۆکێ پیروزی وەکە ئامرازەکێ توندوتیژی و هێرشبرن و چەوساندن و رەشڤەکرنا لایەنێ دی بکار ئینایە ، ژن ( دایك، داپیر) تێکستێن ئایینی وەکە ئامرازێن پاراستن و بەرەڤانیکرنێ کار دئینین.و هەلبەستڤان دوو حالەتێن جودا، دوو جوت دژان تێکهەلی هەڤ دوو دکەت ، توندوتیژی و دلرەقیا هێزێن دوژمنی دگەل دلنازکی و نەرمی و دلۆڤانی و سادەیا گوندیا کو دناخێ ژنا گوندی دا ئەڤ

تێگەهە پتر بەرجەستە کرینە ئەڤ هەردوو حالەتە دنێڤ ئێك گرتەدا بوهژاندینە، داکو ئەم ب پرۆسیسا بەراورد کرنێ راببین :

ژ لەرزا لحێفکا من درەڤی ...

ئو من تم دکێشا

ل ڤێرێ هەلبەستڤان هن خوازە ( استعارە) و وێنەیێن مەجازی بکار دئینیت داکو پتر دەرخستنا ترسێ بکەت, چونکە تەڤایا ڤێ هەلبەستێ ل سەر حالەتەکێ دەروونی یێ پڕ ترس و لەرز هاتیە ئاڤا کرن, لەوما هەلبەستڤان هەول ددەت ب پەیڤ و خوازە و وێنەیێن خوە ڤێ ترسێ ڤەگوهێزیت بۆ خوێندڤانی و وەها لێ بکەت کو نێزیکی حالەتێ ئێکان بیت و دهەمان گەردووندا بژیت.

ئەگەر جارەك دی تەماشەی ڤێ تێکستێ بکەین، دێ بینین ترس و لەرز و ژان و رەڤین ، بووینە تەڤنێ وێ و گشت ڤالاتی و بوشاتیێن دنێڤا وێ دا هەین ، هەمی ب هەڤرا کار دکەن ژ بۆی خولقاندنا فەزایەکێ مەترسیدار ، کو مرۆڤ بچاڤان ب بینیت ئەو گوندێ تێ وێران کرن ، و داروبارێن تێن سوتن و دیوارێن تێنە هەرفاندن و سەروکانی تێنە کونکریت کرن ، بڤی ئاوایی و ب چنینەکا ب هەڤرا گرێدایی ، هەلبەستڤان درێژاهی یی ب وێ خولقاندنێ ددەت ، ئەگەر هەندەك جاران ب بینین کو زێدەگاڤیەکێ ژی تێدا دکەت ، زێدەگاڤیەك پێدڤی یە ژبۆی هێزدارکرنا ئاڤاهیێ هەلبەستێ، ئو مەبەستا وێ ئەوە کو پتر خویندەڤانی یان وەرگری بێخیتە هوندری رویدانێ یان کو دمێشکێ ویدا وێنەی دروست بکەت ، یان ژی ل کەرەستێ هان بکەت کو ببنە دیمەنەکێ بینراو و هەست

پێ کری ، رسته ل دویڤ رستێ, مه بەرەڤ لوتکێ ڤە دبەت، وەها ل مە دکەت کو چاڤەرێی ئەنجامێن دویماهیکێ ب بین و نەمازە چارەنڤیسێ مرۆڤان وەکو نرخترین سەرمایەدار ، یان کو وێ دڤێت بێژیت مەبەستا سەرەکی دڤان کارێن وێرانکاردا, مرۆڤ و ئێرادا وی بووینە:

((ل وێ سپێدەیا ئەروتیك
ئەسمانێ گوندێ من
سورکرن و چاڤێن خۆ ل مە زلکرن
ب شەهمەزاریا خوە
ئەم ل هەمبێزا خوە هاژوتن...))

وەها دبینم کو ئەڤ هەلبەستە ، بەرسڤا پرسیارەك ئاراندنکار و بەلافروتن (سوال استفزازی) بوویە، دبیت کەسەکی وەها تومەتبار کربیت کو وێ ئەو کارەسات و رویدان ئەوێن ب سەرێ گەلێ وێ هاتین ژبیرکرینە:

(چرایێ چاڤێن من، چرایێ چاڤێن من:
من ژ بیرنەکرە،
هەتا ل بیر بینم !)

لێ بەرسڤا وێ مینا پرسیارێ نەبوویە, بەلکو بەرسڤەك نەرم و ئارام بوویە و ئەڤ ساخلەتە ب درێژاهییا هەلبەستێ ساخلەتەك بەرچاڤە و دبینم زمانێ هێرشکرنێ دهەلبەستێ دا نینە, بەلکو هەتا زمانێ بەرەڤانیکرنێ تیدا ب ئاوایەك راستەراست ناهێتە دیتن مینا ڤیژی و هەوار و هاندان, کو ئێکن ژ ساخلەتێن ئەدەبێ بەرخودانێ,

بەلكو سەلوا وەها هەلبەستێ پێناسە دكەت كو دەربڕینەك ستاتیكی یە ب یاریەك زمانەڤانی ژ ناخێ تاكە كەسێ داهێنەر تێتە ئەفراندن.. نە وەك ئامرازەك ژ بۆ گوهرینا جڤاكی و ئەڤێ چەندێ ژی هەلبەستا وێ یا دویر كری ژ شێوازێن راپۆرتی و راستەوخۆ ، هەرچەندە د هەلبەستێ دا بانگەوازیەك هەیە ، لێ ئەو بانگەوازی یا نخافتیە و د كویری یا ناخێ وێ دا دەردكەڤیت ، .. لێ هەر وەكو مە بەریا نها ژی گوتی كو هەلبەستڤان یا ڤەگرێدایە ب دوزەكێ ڤە و دهەر رستەیەكا وێ دا مرۆڤ دكاریت ئەڤێ ئێكێ ڤەخوینیت و رستە بۆ رستێ پابەندبوون ب وی "دۆزێ ڤە هێزدارتر دبیت, لێ نە ب ئاوایەك راستەراست و راپۆرتی, بەلكو ب رەنگەك نخافتی و ب ستایلەك هونەری بۆچوونێن خۆ تێز دكەت و ئەڤ چەندە ژی ل جەم گەلەك هەلبەستڤانێن نویكارخواز دا تێتە دیتن و هەروەها ئەڤ دیاردەیە د هەلبەستا نوی یا كوردی دا وان بۆچوونا ماندەل دكەن ئەوێن دبێژن كو هەلبەستا نوی یا كوردی یا دویر كەفتی ژ دۆز و پرسگرێ یێن جڤاكی.

هەلبەستڤان دڤێ هەلبەستا خۆ دا یا سەركەفتی بوویە د چەوانیا پێكئینانا رستەیا هەلبەستێ و بكارئینانا پەیڤان ب رەنگەكێ ئابووریكرن دپەیڤێ دا هەبیت و گرنگیێ بدەتە چێكرنا وێنەی و بڕینا هەر پەیڤەكا زێدە و نە پێدڤی. ئەڤە ژی ئێكە ژ بنەمایێن خوێندگەها وێنەیێ Imagism ئەوا پتر داخواز ژ هەلبەستڤانی كری كو وێنەیێ هەلبەستكی دروست بكەت و ئابووریێ دپەیڤان دا بكەت و هێمایێن بهێز بكار بینیت ، پێدڤی یە هەلبەستڤان كورت و پەیڤێن

خوه ب شارەزایی کار بینیت ، خوه دویر بکەت ژ حەشو و دووبارەکرنەڤێ ، و بەردەوام بەر ب کورتکرنەڤێ بچیت ، و ب تنێ وێ پەیڤێ بکاربینیت ئەوا دکاریت رووناهیەک نوی و رامانەک تازە د تێکستێ دا بەرجەستە بکەت ، وێ رستێ هەڵبژێریت ئەوا ریتوالەک هەلبەستکی دروست بکەت و زمانێ خوە نوی بکەتەڤە ، هەتا بکاریت ببیتە خودان دەنگەکێ جیاواز و نویگەهـ و سەردەم و رۆلەکێ هەژی دپرۆسەسا نویکرنا زمانی دا ب لەیزینیت .

کوردستان ئۆکتوبەرا ٢٠٠٧ێ

# چیرۆکا خاتینەکێ و
# ڤیانەکا رۆژهەلاتی

**تێکستا هەلبەستکی : لەیلا خورشید**

**خویندن و وەرگێران: ئازاد دارتاش**

**( ١ )**

**داخوازییا ئاکنجیبوونێ**

دەما تە داخوازییا ئاکنجیبوونێ ل گوندێ مە کری

د فەرهەنگا خوە دا .. من تەڤ ناڤ دەرئێخستن

من ناڤێ هوزا خوە .. ژ بیرا خوە بر

و تەڤ داب و نەریت گوهرین

کۆچبەر بووم ژ عەقل و ئایینێ خوە تێپەڕیم

ومن سنوورێن جوگرافیا زەڤیا خوە بەروڤاژی کرن

من ژ هەڕی یێ .. کوخەك ژ مەرا ئاڤاکر
ل جەم دەروکی
بنەفشوکەك چاند
ل گوندێ خوە .. بەرخەك ب کرێ گرت
داکو تە ژ هوڤاتییا من ب پارێزیت
و من ..
بوخێلییەك د کوخا خوە دا ... دانا
داکو ژ بەر تێر گەرم ببین
ئەگەر سەقەما زڤستانێ ل سەرمەدا هات
من جل و بەرگێن کوردی .. بەر خوە کرن
من هەدارا خوە ب بنەفشوکا خوە ئینا ...
و چاڤەرێ بووم

( ٢ )

داخوازکارێ ئاکنجیبوونێ

دەما هاتی مینا باروڤێ ... ئەز سمتم
کوخ و بخێلییا من وێران کرن ...
و ل پاش خوە گولەك چرمسی و پاشڤەمایێن ژنەکێ
هێلان ...

( ٣ )

ئەفسانا ئەڤینییێ

چیرۆکا ئەڤینا من .. ئەفسانەیە
سەرهاتا بەلگێن وەرییاییە

و رۆژەکا ئاڤابوویی
و رێزدارەکێ رۆژهەلاتی
ئەفسانا نازك ترین بایێ من هەناسەکری
و رندترین ئاواز من گوه لێ بووی
ل گۆر زەلامەکی .. ئەز بێ سنوور چێ کریم ..
و لەشێ من ئێخستە ئەدرێسی خوە دا ..
من ب نەهێنی ئەو ڤیا و .. و ب نەهێنی ب کارئینا
لێ راهاتم
مینا لێ راهاتنا زنجی ل سەر مەیی
و لێ راهاتنا
رۆژهەلاتی ل سەر فێلبازی یێ
زەلامەك زاراڤێ وی ئەز کوشتم
زاراڤێ رێزدارەکێ ئەسمان ماچ کری
و مینا نیڤە ژنا
گیانێ من
د شەڤێ دا بوهوژاندی
( ٤ )
وێرانبوونا ئەڤینی یێ
من ژ خوەرا ببە
و ئامیرێن گیانێ من رێك بێخە
رەهێن گیانێ من
نیگار بکە و

جانیٚ من روحدار بکه

ئه‌ز چیٚکری یا ده‌ستیٚن ته

و بوونا لیٚڤیٚن ته‌مه

ڤیانا ته کاڤلبوونه‌که هه‌ڤریشی من دبیت

خوینا من ڤه‌درسینیت

من د سوژیت و مانده‌ل و په‌ریشان دکه‌ت

من دکه‌ته میٚ و من دخوت

نیٚچیره‌ك د سه‌رده‌میٚ کولپیٚ دا

ب ده‌ستیٚن ته سه‌ریٚ من هه‌ڕشی

و ب پیٚن ته سینگیٚ من په‌لخی

وه‌لیٚ دلیٚ من تو ب روژهه‌لاتڤانییا خوه د شه‌وتینی

ژ مروڤه‌کی کو ئه‌ز ژیٚ په‌یدا ب بووم

تو د ببیه هوڤه‌ك

من پرتی پرتی دکه‌ت

( ٥ )

باوه‌رییا ئه‌ڤینیٚ

بیردانکا ته د دلیٚ من دا .. گه‌نی بوو

و پیتیٚن هه‌لبه‌ستاته وه‌ندا بوون

هاڤی بووم

من هه‌ول دا جاره‌ك دی ژ من په‌یدا ببی

بیٚیه بامن زارویه‌ك د شه‌ڤه‌کا زڤستانیٚ دا

ژ من را ببیه هه‌لبه‌سته‌کا دلداری یی

نکراندی بن
پیتێن وێ د هوندری ماکا من دا
دا تە بچینم پێغەمبەرێ ئۆلێ خوە
ئۆلێ هوڤەکی ..
هەمبێزا نەریتێن تەڤ ئۆلان کری
داکو زەلامەکی ژ خوە را نێز بکەت

( ١ – ٢ )

لەيلا خورشيد ، ئافرەتەكا كوردە ، و هەرچەندە ب زمانێ عەرەبى د نڤيسيت ، لێ دەربرينێ ژناخێ ئافرەتەكا كوردا بازێرى دكەت ، د تێكستێن خوە يێن ئەدەبى دا ، هەول ددەت ب ديدەك مێ هزر بكەت و ب مێياتى دياردە و مژارێن جودا ڤەخوينيت ، دەما من تێكستا وێ يا هەلبەستكى ( چيرۆكا خاتينەكێ و ڤيانەكا رۆژهەلاتى ) ئەوا ب زمانێ عەرەبى هاتيە نڤيسين و د گوڤارا مەتين هژمارە ( ١١٥ ) ل ئابا ٢٠٠١ هاتيە بەلاڤكرن خويندى, من هەستكر كو دكارين ڤێ تێكستێ ئێك ژوان تێكستێن دەگمەن ب هژمێرين ئەوێن ب خامێ ئافرەتێ هاتينە نڤيسين, چونكە ب وێرانە ل دور هنەك مژاران ئاخفتيە ، كو تا نها دجڤاكەكێ دائێخستى مينا جڤاكێ مە, كێم ئافرەت شيانە خوە ل ڤان مژاران بدەن ... بو نموونە ئەگەر ئەم تەماشەى پرانبيا تێكستێن ب خامێ ئافرەتێ هاتينە نڤيسين بكەين ، دێ بينين نڤيسكارا ژن مينا زەلامى هزر دكەت ، لێ خانما لەيلا هەول دايە ل ڤى بازنى دەربكەڤيت و وەكو رەگەزەكى جياواز هزر بكەت و سەرەدەريێ دگەل دەورو بەرێ خوە ل پەى دانێن وێ جياوازييا هەى بكەت . دەما مە ئەڤ تێكستە و هنەك تێكستێن دى يێن لەيلا خانێ خويندين ، هزرا ئێكێ ئەوا دمێشكێ من دا جهگير بووى ، كو لەيلا خورشيد چ غەوغائييەكە ، وێ دڤێت هەمى تشتان سەرو بن بكەت ، خودان چ پروژەك كارەساتييە ، وێ چ ئارمانج

نینە ژبلی وێران کرنێ ، وێران کرن ب تنێ بو وێران کرنێ بیت ، لێ پشتی چەندین ڤەخویندنا بو من وەها دیاربو کو ئەڤ نڤیسینە دبیت ئەنجامێ هنگافتنەکێ بیت ، کو وێ هنگافتنێ کارتێکرنا خوە ل سەر دەروونێ وێ کربیت وشێن تلێن خوە نە ب تنێ ل سەر تێکستا وێ کربیت بەلکو ل سەر تەڤایا ژیان و کەسینییا وێ کربیت ، لێ لەیلایێ دڤێت ژ نە سیستەمی یێ ، سیستەمەکێ دروست کەت و لوژیکەکێ ژ نە لوژیکیێ بەرجەستە بکەت ، و ل جەم وێ هنگافتن وەرچەپەکە ژ بوی دەسپێکەکا نوی و نڤیسین ل جەم وێ پروژەکێ هەمەلایەنە ، کو وێ دڤێت خوە رزگاربکەت ژ قەید و سانسور و بەندان ، لەومازی ئەو د تێکستا خوە دا مروڤەك هاڤیبوویە ، مروڤێ هاڤی ژی لەپەی دیدا مە مروڤەك یاخییە و هەلبەت مروڤێ یاخیبوویی و ب تایبەت ژن و د جڤاکەك رۆژهەلاتی دا ، دێ بەرییا هەرکەسەك دی بیتە قوربانی .. دڤێ تێکستێ دا ، بومە خویا بوو کو لەیلا هزرێن زال رەت دکەتەڤە و هەول ددەت کو ب دیدەك دی تەماشەی دیاردەو تێکستا بکەت ، هزرێن یەقینی، ئەوێن زال د جڤاکێ مەدا ، ل سەر بنەمایێ هەبوونا دووانێن جیاواز و هەڤدژ هاتینە ئاڤاکرن ، و وەها هزر دکەن کو دنێڤبەرا دووانێن ژێك جودا و جیاواز ، هێلێن ڤەبڕ هەنە ئەڤ هێلە هەمی وەها تشتان دابەش دکەت ل سەر دوو جەمسەرێن هەڤدژ و بەردەوام هەڤرکیێن خوینەلوێ و هەمیشەیی دنێڤبەرا ڤان هەردوو جەمسەرا هەیە ، و ب هێزبوون و هەبوونا ئەڤی لایەنی یا ڤەگرێدایە ب لاوازبوون و نەمانا لایەنێ دی . و هەرئێك ژوان هزر دکەت کو هەمی راستی ل جەم وی نە و پروژێ خوە ب پروژەك نایاب و تەمام و رەوا ل قەلەم ددەت و پروژێ

دى يێ جياواز پروژەك چەوت و وێرانكار ل قەلەم ددەت لەوما ژى دنێڤبەرا ڤان هەردوو جەمسەرا چ پرێن دايەلوكێ ناهێنە دروست كرن ، لەيلا ڤێ هزرێ هەر د بنەرەت دا رەت دكەتەڤە ، و وەها د تێكستا وێ ديار دبيت ، كو وێ باوەريەك دى هەيە ، و دبينيت كو دنێڤبەرا دوو وانێن ژێك جياواز دا بياڤەك بەرفرەهـ و بەرين هەيە ، و ئەو هێلا هزرا يەقينى دمێشكێ خوە چەسپاندى ، هێلەك وەهمى يە ، بەلكو بياڤەك هەيە ودوى بياڤيدا مروڤ دكارن پتر ب ئازادانە كار بكەن ودنێڤبەرا ڤان دووانييا دا چەندين خالێن هەڤ پشك هەنە كو هەر دوو ئاليان ب هەڤرا گرێدەت و هەر ئێك ژوانا رەواتييا هەبوونا خوە ، ژ رەواتييا هەبوونا لايەنێ دى وەردگريت و پروژە و هزرێن ڤەكرى ل سەر ڤى تەوەرى كار دكەن و هەول ددەن ڤان خالێن هەڤپشك بەرچاڤ بكەن ، بەروڤاژيیا هزرێن رەها و يەقينى ، ئەڤ هزرە ب تنێ خالێن ژ ئێك جودا كرنێ زق و بەرچاڤ دكەن و ل ڤێرێ ئەڤ هزرە هەردەم دبنە ئەگەرا دروستبوونا قەيرانا ، چونكە هزرێن هان هەول ددەن ئێك ئەوێ دى رەش كەتەڤە و هەلبەت ئەڤ ئاڤاهى يێ هزرى يان ب گوتنەك دن ئەڤ پروژێن هزرى ، كارتێكرنا خوە دكەنە سەر كارێن ئەدەبى وهونەرى ژى هەر چەندە ئەدەب دپێناسا خوە دا بەرى يا هەر تشتەكى لڤينەك زمانەڤانى و ستاتيكى و هونەرييە ، لێ ئەڤ لڤينە و هەر لڤينەك دى ل سەر پروژەك چاندى و هزرى هاتينە ئاڤاكرن ، و ل پەى باكراوەند و كەلتورەك دياركرى تێتە رێڤەبرن ، و جارەك دى دێ ڤەگەرێم و بێژم كو هزرێن زال وبهايێن جوانى يێ د جڤاكێ مەدا ، كار كريە سەر كارێ مە يێ ئەدەبى كێم جاران مە خويندييە هەتا تێكستێن هەلبەستكى ژى شيابن

خوە ژ ڤی کەلتوری قورتال بکەن ، بەلکو هەردەم ل ژێر فشارا دیدەك رەها کار دکەن .... لەوما ژی کار ل سەر بیاڤا بەرینا دنێڤبەر دووانییا دا کێم هاتیە کرن ، دڤی تێکستا هەلبەستکییا خوە دا ، لەیلا خورشید هەول ددەت ل سەر ڤی بیاڤی راوەستیت ، و دبینین کو یا ب سەر هژمارەك دەرزان هەلبی .. و دبینم کو دنێڤ وێ بیاڤا مە بەحس لێ کری هژمارەك بن نەهاتی ژ دەرزان هەنە و تورەڤانێ شارەزا دێ کاریت ل سەر ڤان دەرزا کار بکەت, رێژا هێڤراندنا دەرزان کار دکەتە سەر زمان و وێنە و رستێن هەلبەستێ ، هەر وەها سازڤانێ شارەزا دێ کاریت پەیوەندیێن نوی دنێڤبەرا پەیڤان دا دروست بکەت و هژمارەك رستێن دی پێن نەگەهی دروست بکەت .

لەیلا دنێڤبەرا ڤان دووانییان (ئاکنجیبوون _ کۆچبەربوون ) کار دکەت ، دنێڤبەرا وان دا لەیلا دشێت بیاڤەکا تنگژینێ دروست بکەت ، وتێدا هژمارەك هێما هەنە کو دکارن پتر ژ خویندنەکێ هەلگرن .. هەر چەندە هەمی رستێن ڤێ تێکستێ د هەلبەستکی نینە بەلێ ئەڤ چەندە د هەمی هەلبەستان دا دیاردەك بەر بەلاڤە ، هەتا رادەیەکێ ئێك ژ رەخنەگرێن عەرەب دبێژیت : هەتا هەلبەستێن شاکارێن ( متنبی ) ژی سەر هەتا بن هەلبەست نینە ، بەلکو وان ژی حەشو یا تێدا هەی, ئەڤ تێکستەژی ژ ڤێ گوتنێ یا بێ بەهر نیە ، لێ هژمارەك رستێن هەلبەستکی تێدانە .

دبینم بەرییا هەر دیاردەکی نەزعا خوە تەجریدکرنێ تێدا یا خویا و بەرچاڤە :

**دەما تە داخوازی یا ئاکنجیبوونێ ل گوندێ مە کری**

## كۆچبەربووم ژ عەقل و ئايينێ خوە تێپەڕیم
## من ژ مەڕییێ ... كوخەك ژ مەرا ئاڤاكر

لەيلا ل ڤێرێ دنێڤ ڤان دووانیيادا ( ئاكنجيبوون – كۆچبەربوون ) پەيوەنديەك نوى دروست دكەت ، كو هەر لايەنەك لايەنێ دى رادكێشيت هەتا رادەيەكێ كو چ جوداهى دنێڤبەرا وان دا نامينيت ، بەلكو هەردوو لايەن دێ كارن هەر گاڤا وان بڤێت جهێن خوە ژێك بگهوڕن و هەمان رامان و دەلالەت بدەن ، لڤێرێ لەيلا دبيتە سوّفيگەرەك دڤێت هەمى جيهانێ ، دنێڤ ئێك جە دا كوّم بكەت و رەهاتييەكێ ب دەتە دەمى .... ( دەرئێخستنا ناڤا د فەرهەنگيدا ، ناڤێ هوّزا خوە ژ بيرا خوە بدە ، گوهڕينا داب و نەريتا ... ) .

يان ب گوتنەك دن ... عەقل نوينەراتييا عەقلێ زال د جڤاكى دا دكەت و ئايين دەربڕينێ ژ تەڤايا پيروزييا دكەت ، زەڤى وەكو جە هێمايە بو بياڤەك بەرفرەهتر ، كو دێ كارين ڤێ بياڤێ بەرين و بەرين تر بكەين ، هەتا رادەيەكێ كو رۆژهەلاتێ هەمييێ ڤەگريت ... ل ڤێرێ كارەكێ هزرى بەرچاڤ دبيت ، ئەو ژى خويندنا عەقلييە ، و هەلبەت ئاڤاهييێ هزرى ژى هەر وەكو بەرييا نها مەگوتى ئێكە ژ ستراكتور و بنەمايێن هەلبەستێ ، نەمازە هەلبەستا پەخشانكى ل سەر تێتە ئاڤاكرن ، و ئەڤ ژانرێ ئەدەبى ل سەر موزيكا پەيڤا و ئاڤاهييێ زمانەڤانى ب تنێ ناهێت ئاڤاكرن ، بەلكو د حالەتێ وەرگێرانێ گەلەك ساخلەتێن خوە يێن موزيكى و يارييا زمانەڤانى ژ دەست ددەت لێ تشتەك گرنگ دمينيت ، ئەو ژى وێنەيێ هزرى يە ئەوێ د مێشكێ

وەرگری دا دروست دبیت کو وێنەکێ پێکهاتی بیت ژ هژمارەك هێمایێن خودان دەلالاتێن هزری ، ئەگەر ئەم ل سەر رستا :

**" من ژ هەرپییێ کوخەك ئاڤاکر ..."**

راوەستین ، بەرییا هەر تشتەکی دێ بینین کو هەلبەستڤانێ گەلەك جاران ب درێژاهییا ڤێ تێکستێ پەیڤا من ب کار ئینایە ، ل ڤێرێ ئەو دبیتە بکەر و ئەڤەژی دناخێ خوە دا یاخیبوونە، چونکە ژن د کەلتور و تێکستێن مە ب کەر نییە ، چونکە یا ئازاد نییە و مروڤێ دیل هزرا خوە دگوهرینێ دا ناکەت و دنێڤبەرا گوهرینێ و ئازادییێ پەیوەندیەك موکم و هەڤ دوو تەمامکەر هەیە ، یان ب گوتنەك زەلال تر ، هەتا تو مروڤەکێ ئازاد بی پێدڤی یە بزانی ئەو چییە دێ کاری ب گوهرِی و ئەو چییە کو دشیانێن تەدا نییە کو تو بگوهرینی ، ل ڤێرێ یان ب گەلەك بکارئینانا پەیڤا ( من ) دیار دبیت کو لەیلا ئازادییا خوە پراکتیزە دکەت شیانێن خوە و دە ئەگەر ... دیسان ئەم بنێرینە رستا ناڤبری, دبینین کو لەیلا یا جارەك دی ئاکنجی دبیتەڤە .. ئەڤ ئاکنجیبوونە یان ئەڤ بریارە لپەی داخوازا ئەوێ دی هاتیە دروست کرن ، لێ ئەڤ ئاکنجیبوونە ، ئاکنجیبوونەکا کاتی و بەروەختە ، چونکە کوخ بو دەمەکێ کورت یان بو وەرزەکی تێتە ئاڤاکرن و دجڤاکێ کوردیدا کوخ یا ڤەگرێدایە ب خودانێن پەزی ڤە یان پتر ب خەلکێ رەڤەندڤە. و هەروەها هێمایەکێ خوە ڤەدەرکرنێ یە و ئەڤ خوە ڤەدەرکرنە ژی دەلالەتێ هاڤیبونێیە ، هاڤیبونە ژ تەڤ داب و نەریت و بها و قیەمێن جڤاکی یێن زال ... جارەك دی دارێژتنا کۆمەك تێگەه و بهایێن نوی کو مروڤ تێدا یان د چارچوڤێ

واندا بكاريت ئازاديا خوه پراكتيزه بكەت ، داخوازەكە ژبوى گوهرپينەكا بنەرەتى بەر ب بەروڤاژيكرنا چەوانييا هزركرنى "

**( كۆچبەربووم ژ عەقل و ئايينێ خوه تێپەرپم )**

**ومن سنوورێن جوگرافى يا زەڤيیا خوه بەروڤاژى كرن )**

ل ڤێرێ ديسان وێنەيەكێ هزرى د مێشكێ وەرگرى دا بەرجەستە دبيت و لەيلا ئاشكرا دكەت كو نە ب تنێ پێدڤيیە ل سەر ڤان بهايا راوەستين بەلكو يافەرە ل سەر وى عەقلى راوەستين ئەوێ ئەڤ هزرە بەرهەم ئيناى ، ئەو عەقلێ پيروزييا دروست دكەت و دكەتە سانسۆر ل سەر هەمى جۆرێن لڤينا خوە ، عەقلەك وەها پێدڤى ب پرۆسەك ريفۆرمخواز نييە بەلكو پێدڤييە ڤەقەتيانێن ئەپستمولوژى دگەل وى عەقلى بهێت دروست كرن .

لەيلا دبێژيت :

**من ژ هەرپيێ ... كوخەك ژ مەرا ئاڤاكر**<br>
**ل جەم دەروكى**<br>
**بنەفشوكەك چاند**<br>
**ل گوندێ خوه ... بەرخەك ب كرێ گرت**<br>
**داكو تە ژ هوڤاتييا من ب پارێزيت**<br>
**ومن بوخێلييەك د كوخا خوەدا ، دانا**

ئەز دوێ باوەرييێ دامە كو دنێڤبەرا ڤان رستان دا هژمارەك هێمايا هەنە و مروڤى رادكێشن, چونكە ئەو پەيڤێن وێ د تێكستا خوە دا بكارئينانين ( كوخ ... بنەفشوك ...بەرخ ... بوخێلى ) تشتەك نوى لێ چێكرييە – بەرييا هەر تشتەكى لەيلا نەفرەتێ ل توند و تيژيێ دكەت ،

( ل گوندێ خوە .. بەرخەك ب كرێ گرت داكو تە ژ هوڤاتییا من ب پارێزیت ) بەرخ وەكو هێمایەك بۆ دلوڤانی و بەزەیی یێ ، سادە و زەلال .. ب كرێ دگریت چونكە دزانیت ئەوژی و عەقلێ وێ ژی بەرهەمێ كەلتورێ جڤاكەك دائێخستییە, كەلتورەك توند و تیژییێ ب رەوا دبینیت ، لەیلا ددەت خویاكرن كو دناخێ مە هەمیان عەجزەك دیموكراسی هەیە لەوما ژی ئەم بەردەوام پەنای دبەینە بەر ب كارئینانا هێزێ . ل ڤێرێ بەرخ دبیتە داخوازەك ژ بوی خۆ قورتالكرنێ ژ هزرێن توندرەو و رەها نموونەك دی پێشنیاز دكەت بۆ پەیوەندیێن دنێڤبەرا تاكە كەسان .. كو تێدا تاكە كەس یێ ئازاد ب رامانا رێزگرتن و پاراستنا ئازادییا ئەوێ دی . وەكو مەرجەك ژ بو دابینكرنا پێكڤەژیانەكا ئارام و بەختەوەر كو هەر ژ كەڤن وەرە ئارمانجا دیروكی بوویە ، و ئەڤ داخوازە هەردەم داخوازەك رژد بوویە ل جەم دەستەبژێرەكا هەلبژارتی د جڤاكێن مروڤینیدا ، دیسان هەر ل دەسپێكا ڤێ تێكستێ دا دیار دبیت كو رێژا پابەندبوونێ ل جەم قەهرەمانا هەلبەستێ ، پابەندبوونەك لاواز و سستە ، و ئاستێ پابەندبوونێ یا ڤەگرێدایە ب هژمارەك مەرجێن جودا جودا ڤە ، نەمازە مەرجێ چاندی و هزری ، ئەگەر مروڤ دگەل نرخ و بهایێن جڤاكی و چاندی یێن زال یێ گونجیای بیت ، هەلبەت دێ ئاستێ پابەندبوونێ ژی ب هێزبیت ، و لەیلا دڤێ تێكستێ دا ، یا دوودل و یاخییە ، دڤێت كو ژیانەك نوی دروست بكەت و ژیانا نوی ژی جهگیر نابیت ئەگەر مروڤ دناخێ خوە دەست ب گوهرینێ نەكەت ، یان ب گوتنەك دی ژیانا نوی بەرهەمی شورەشەكێیە ، كو ئەو شورەش بیڤەلەرزەك بیت ، گەلەك تشتان سەرو بن بكەت :

من
بوخێلییەك دكوخا خوەدا دانا
داكو ژبەر تێر گەرم ببین
ئەگەر سەقەما زستانێ ل سەرمەدا هات
من جل و بەرگێن كوردی بەرخوە كرن
من هەدارا خوە ب بنەفشوكا خوە ئینا ... و چافەرێ

بووم .

ل ڤێرێ ڤەگەڕیانەك دروست دبیت ، مروڤی ڤەدگەڕینیت بەرەڤ چەرخێن بەرێ ، تەڤ قەهرەمانێن ئەفسانە و چیروكێن ئەڤینییێ دمێشكێ مروڤیدا بەرهەڤ دبن ، بوخێلی ریتوالەكێ سحری دروست دكەت ، ریتوالەك پڕ ئاشوپ و پانورامایەك رومانسی بەرجەستە دبن ، دیارە لەیلا كچا باژێرییە و د باژێریدا توشی زۆر گرفت و ئاریشان بوویە و كارتێكرن د ناخ و دەروونێ وێ كریە تا رادەیەكێ باوەری ب ژیان و پەیوەندیێن باژێری نەمایە ، چونكە دبێژیت ( من جل و بەرگێن كوردی بەر خوە كرن ) و ئاشكرایە كو بەرییا هنگی ، وەكو پرانییا خەلكێ باژێرا جلو بەرگێن دی ل بەركرینە .

و هەروەها دبێژیت ( من هەدارا خوە ب بنەفشوكا خوە ئینا ) ل ڤێرێ ژی لەیلا مە بەرەڤ دیمەنەكێ مژدار دبەت ، بەر ب جیهانەك تەنا و بێ دەنگ .. بەرەڤ سروشتی و پەیوەندیێن وندا و بەرزە بوویی ، ب تنێ د چیروك و رۆمانێن رومانسی ئەڤ گەردوونە مایە ،سەقا دلسوزی و خوشەویستییێ ، هەروەها لەیلا دەربڕینێ ژ سوزدارییا خوە وەكو تاك دكەت ، حەز و ئارەزو و خوشی و خەم و ژانا تێكهەل دكەت ، چ سنوورا

دنێڤبەرا هەستێن جیاواز دا ناهێلیت ، بەلکو لەیلا خوە دکەتە پیڤەر و داخوازێ ل جڤاکی دکەت ، کو جڤاك ژ ئارەزو و حەز و هزرێن وێ بگەهیت ، جڤاك یێ داخواز کرییە کو رێزێ ل هەلویستێ وێ بگریت ، یان ب رامانەك دی ، لەیلا خوە د کەتە خالا دەستپێشخەری یێ بەرەڤ گوهرانکارییێن جڤاکی یێن بەرفرەھ ، و لەوما ژی دکەڤیتە هەڤرکیەکێ دگەل دەوروبەرێ خوە ، هەتا رادەیەکێ خوە ژوان ڤەدەر دکەت ، و ب تنێ چاڤەرێ ی وی کەسی دکەت کو دوی ئاستی دایە نە بتنێ حەز و ئارەزوێن وێ تێر بکەت بەلکو ب تشتەك رەوا ل قەلەم ددەت . دبیت ئەڤ چەندە یا ئاڤاکری بیت ل سەر بنەمایێن سێکسی لێ بەرامبەر ژی ئەڤێ چەندێستراکتورێن سیاسی و کەلتوری ژی هەنە ، بو نموونە و ل پەی پیڤەرێن زال ، پێدڤی تاکە کەس د چارچیڤێ کۆمێ دا هزر و کار بکەت, لێ لەیلایێ دڤێت ل دەرڤەی کۆمێ هزر بکەت ، و هەڤرکی دنێڤبەرا تاکە کەس و کۆمێ هەڤرکیەك دێرینە و د هەمی جڤاکان دا هژمارەك کەس هەنە بووینە قوربانیێن کۆمێ و دبیت لەیلا ژی ئێك ژوان قوربانییا بیت و د جڤاکێن دائێخستی دا ئەڤ کاروانێ قوربانییا ، کاروانەك بەردەوام مە ، لێ ئەڤ قوربانییە پێدڤینە داکو جڤاك ب گشتی ژ چارچیڤێن نەلڤ و مەند قورتال ببیت ، بەرەڤ جڤاکەکێ پێشهەل کو ب کاریت هەمبێزا گوهرین و دانێن نوی بکەت ... و د بێژیت :

من هەدارا خوە ب بنەفشوکا خوە ... ئینا ...

و چاڤەرێ بووم

ل ڤێرێ ژی ، لەیلا پتر بەرەڤ سروشتی دچیت و وەها دیار دبیت کو یا بێزاربووی ژ دەستکەفتێن زانستی ب تایبەت د بوارێ گەهاندنێ دا کو

پڕانییا خەلکی ئەڤرو هەدارا خوە بڤان دەستکەفتا تینن و بنەفشوك وەکو هێمایەك بو زەلالی و جوانییێ ... و هەلبەت دنێڤبەرا وێ و بنەفشوکێ دایەلوکەك دروست دبیت ... ب تنێ ئەو هەستێ پێ دکەن چونکە هەرئێك ژ وان چێکرییا ئەوێ دی یە و ئێك دوو تەمام دکەن ، لێ بنەفشوك ژی نە بتنێ گولەك وەرزییە بەلکو یا کێم ژییە ژی لەوماژی دکارین پتر بێژین کو قەهرەمانا هەلبەستێ باوەری ب ئاکنجیبوونا بەردەوام نییە بەلکو ب تنێ هزرا گوهرینێ د مێشکێ وێدا یا ئاراندییە و ئەڤ ئاکنجیبوون و خوە بەرهەڤکرن ب تنێ بو مەرەمەکێیە و هەرگاڤا هاتە ب جه ئینان دێ دەست ب ژیانەك نوی کەت ، ئەڤەژی ڤەدگەرێت بو دوو دلییا دەروونی و نەباوەری بوون ب پاشەروژێ .

**و چاڤەرێ بووم ..**

لێ ئەڤ چاڤەرێیە ، چاڤەرێیا گوّدوّی نەبوو ، و داخوازکارێ ئاکنجیبوونی هات ... و هاتناوی یا ب هێز بوو ( مینا باروڤێ ) و گەلەك کارێن کارتێکار ئەنجام داینە و د شێین ل سەر سێ ئاستان پارڤە بکەین :

١- ل سەر ئاستێ وێ – چ ژ لایێ دەروونی یان جەستەیی بیت:

**( ئەز سمتم ... پاشڤەماییێن ژنکێ )**

٢- ل سەر ئاستێ جهی : **( کوخ و بخێلی یا من وێران کرن )**

٣- ل سەر ئاستێ سروشتی : **( گولەك چرمسی )** .

و دەما لەیلا پەسنا ئەڤێ هاتنا کورت و ب لەز دکەت ، مە دئێختە بەرامبەر هژمارەك دیدێن کو دبیت دیدێن هەڤدژ و جیاواز بن و دنێڤبەرا وان دا بیاڤەکا تەنگژینێ دروست دبیت :

چیرۆکا ئەڤینامن ... ئەفسانەیە
سەرهاتا بەلگێن وەرییاییە
و رۆژەکا ئاڤابوویی
و رێزدارەکێ رۆژهەلاتی
ئەفسانا نازکترین بایێ من هەناسەکری
و رندترین ئاواز من گوه لێ بووی ..
ل گور زەلامەکی .. ئەز بێ سنوور چێ کریم

هەروەکو مە گوتی کو دڤێ پەسنێ دا ، لەیلا دنێڤبەرا هەست و نەستێن جیاواز دا پەیوەندییەکێ دروست دکەت ، لەیلا سێ قوناغان یان سێ دەمێن ڤەشارتی تێکهەل دکەت ( چاڤەرێ بوون ، هاتن ، مالئاڤاهی ) هەتا رادەیەکی ئەڤ سێ حالەتە تێکهەلی هەڤدوو دبن و خودانا تێکستێ هەول ددەت ڤان هەر سێ دەمان ب هەمی رویدان و رامان و هێمایێن خوەڤە دنێك قەوارەدا بەرجەستە بکەت ، جارەك دی لەیلا وەکو سۆفیگەرەك سەرەدەرییێ دگەل دەمی و تشتێن دی دکەت و دهەولەك دۆمدار دایە کو خوە دگەل ئەوێ دی دنێك قەوارەدا بوهژینیت ، و دبیت ب بینیت کو مروڤ هنەك جاران خوشی و چێژێ ژ ئازاردانێ وەربگریت و ئەڤ حالەتە پتر د کریارا زایەندیدا ل جەم هنەکا تێ هەست کرن یان ئازار ل جەم وان دبیتە فاکتەرەکێ ئەکتیڤ ژ بوی ب لووتك گەهاندنا وێ خوشییێ و دبیتە ئەگەرا دروستکرنا چێژەکا بێ سنوور ، ل ڤێرێ لەیلا یا رەشبین نییە ئەگەر بەلگێن گولا وەریان چونکە وەریانا بەلگان

دیاردەك سروشتییە نەمازە پشتی ب دویماهی هاتنا قوناغێن شین بوونێ ، دیسان روژ ئاڤابوون رامانا مرنێ ل جەم وێ نادەت بەلكو ب هاتنا شەڤێ دێ پتر كاریت چێژێ ژ دیمەنێن جوان و دلڤەكەر وەربگریت ، و دكاریت ئازادییا خوە پتر و دویر ژ چاڤێن نەحەز و پارێزەرا پراكتیزە بكەت ، ل ڤێرێ لەیلا ڤان هەردوو هێمایا ژ رامانێن وان یێن بەرێ ڤالا دكەت و رامانەك نوی ددەتێ ، و ئەڤەژی ئێكە ژ ساخلەتێن زمانێ هەلبەستكی ، كو مەرجە بەردەوام ڤارێبوون تێدا بهێت كرن ،لەیلایێ دڤێت بێژیت كو چیروكێن ئەڤینییێ هەردەم خوەدی دیماهیكێن خوش و دلڤەكەر نینە ، و ددەت خویاكرن كو چیروكا ئەڤینیا وێ دقوناغێن خوە یێن سروشتی دا بورییە ، و مالئاڤاهی ئەنجامەكێ سروشتی بوویە چونكە هەل و مەرجێن پێدڤی بو دیماهیكەكا خوش نەهاتبوونە دابین كرن ، دبیت وەرار و پێشكەفتنا جڤاكی دوی ئاستی دا نەبن كو دەور و بەر فەهما دید و بوچوون و هەلویستێ وێ بكەن ، لەوماژی نابینین كو چ گل و گازندا بكەت بەلكو ل جەم وی یا دروست ئەو بو ئەوا هاتییە رویدان لەوماژی ئێك هێمایا پێشەمانییێ دهوندرێ ڤان رستاندا نابینین بەلكو بەروڤاژی دڤێت بێژیتە ئەوێ دی, یا پێشەمان نیمە ل ناسینا تە ، ئەگەر پتر كوپلا سەری هاتییە نڤیسین ڤەخوینین دێ بینین كو هێمایێن وێ ل سەر دوو جەمسەرا دابەش بینە ، یا ئێكان دەبرینێ ژ خەم و رەشبینی و

دوودلیەکا دەروونی یا ڤەشارتی دکەت ، ( **سەرهاتا بەلگێن وەریاییە ، رۆژەکا ئاڤابوویە** ) و یا دووان ژی دەربڕینێ ژ خوشی و تێرکرنا حەزا و دەمێن پر چێژ دکەت ( **نازکترین بابێ من هەناسەکری ، رندترین ئاواز من گوهـ لێ بووی** ) و دێ مینیت پەسنا ئەوێ دی ( **رێزدارەکێ رۆژهەلاتی** ) کو ئەڤ پەسنە هەردوو حالەتێن سەری ب هەڤرا گرێ ددەت و دنێڤبەرا وان دا تۆڕەکا پەیوەندییا چێ دکەت کو دبیتە ئەگەرا ڤەبوونا تێکستێ ل سەر هنەك ئاسوییێن دی کو خوینەدەڤان بێ چاڤەرێی وان نەبوو ئەڤەژی دبیتە ئەگەرا دروستبوونا دەرزەك نوی کو مرۆڤ ب کاریت پتر چێژێ ژ ڤێ تێکستێ وەربگریت و ب ڤی ئاوایی لەیلا شیایە بەردەوام بیاڤێن تنگژینێ پەیدا بکەت و ب رستێن هەلبەستکی تێکستا خوە تێندار بکەت.

# هەڤركی د هوزانا پێشمەرگەدا

سەرهەلدانا بهارا سالا ١٩٩١ رویدانەكا مەزن بو ، شینوارێن خوه نە ب تنی ل سەر نەخشەیا سیاسی و جڤاكی هێلاینە ، بەلكو ل سەر ژیانا هزری و روشەنبیری ژی ، لەوماژی دخویندنا تۆرێ كوردیدا یێ كو پشتی سەرهلدانێ هاتیە نڤیسین دێ بینین كو ئەڤ كارێن تۆرەیی ب رەنگەكێ مەزن داخبار بووینە ب وێ رویدانێ ، ئەڤ ژی نە تشتەك فیز و ئەنتیكەیە ، چونكە هەر كارەكێ تۆرەیی پێدڤی یە بیبتە بەرهەمێ كەتوارەكێ خوەیا و قوناغەكا دیروكی یا دەستنیشانكری .
دبێژین سەرهلدان رویدانەكا مەزن و پڕ بها بو ددیروكا نوی یا گەلێ مەدا چونكە بو جارا بێكێ بو ،ئەڤ مللەتە ددیروكا خوەیا نوی دا شیا خاكا خوه رزگار بكەت و داگیركەران ژ ئەردێ خوه رامالیت ، پڕانیا هوزانڤانان ل پێش ڤێ رویدانی دلشاد و مەندەهوش راوەستان و راستی یا هندێ بو وان خویا بو كو ئامراز و شێوەیێن وان یێن

هوزانێن کەڤن نکارین دەربڕن و وەرگرتنا ڤان گوهرپینا بکەن . دەما ئەم هەر کارەکی تۆرەیی بخوینین گەرەکە ئەم لژێر رەوشا گوهرپین و ب سەرپێکداچوونا وێنەیێن کو نوینەریا رەوتا کەتواری دکەن ب خوینین ، ل ڤێرێ ژی پێدڤی یە ئەم رۆلێ دامێنەری ژبیرنەکین چونکە ئازادییا دامێنەری و یا نڤیسەری کارێ خوە دکەت .

هەر نڤیسەرەکی دوو جیهان یان ژی دوو جڤاك هەنە ، جیهانا وی یاکەسایەتی ، یا دوویێ ژی ئەوجیهانە یاکو هوزانڤان (( نڤیسەر )) تێدا دژیتن ، (( جڤاك )) ب تەڤ هەڤرکی و دژاتی یا خوە ڤە ، د ئەنجامدا بێگومان ئەڤ کارێن هەنە دێ دکەت بن زێالیێ شێوەیی ڤە و ودێ د هەڤپشك بن دگەل تشتێن دی زێالیێ ناڤەروکی ڤە ، دەربارەی ڤێ چەندێ ژی نڤیسەر جاکوب کورك (( Jacobkrg)) (٢) دبێژیت : (( شێوە ئەوە یێ کو کاری دکەتە تایبەتی ، ناڤەروك ژی ئەوە کو دکەتە هەڤپشك دگەل تشتێن دی )) .

(( پێشمەرگە )) ناڤ و نیشانێت هوزانەکا هوزانڤان (( هزرڤان )) ە و تێدا هوزانڤان خوە ژ شێوەیێن هوزانێ یێن نیاس دەرباز دکەت و ل زمانەکێ نوی یێ هوزانێ دگەرهیت ، دڤێ ڤەکولینێدا ژی دێ هەولدەم ب تنێ ئاڤاهیێ هوزانێ بگرم ب رێکا خواندنا ستوینێن وێ یێن جوانیێ و ئاڤاکرنێ یێ راڤەکرنا جەڤەنگێن وێ یێن سوسیولوژی . مینا مە ل پێش گوتی سەرهلدان رویدانەکا مەزن بو , ڤێ رویدانێ ژی وێنەیێن نوی دمشێ هوزانڤانی دا پەیداکرن . ئەڤجا فەربو هوزانڤان لدویف قالبەکێ دی بگەرهیت ژبۆنا تێکرنا ڤان هەمی بیروبۆچوون و هزران ، لسەر ڤێ چەندێ (( ئەدینۆس )) دبێژیت : (

گەر تەڤیا نویكرنێ بكەی ، تە نەژبەر نویكرنێ ب تەنێ یە ، تە ژبەر هندێ یە كو تە هنەك گوتن هەنە ناهێنە گوتن بێی نویكرن ) (٣) .

دڤێ هوزانێدا ، ئەز نویكرنێ دبینم هەڤركییەكە دژی گەنیبوونا زمانی یان كو گەڕهان لدویف رامانەكا كویر تر یان ژی دانا هنەك رامانێن دی و كارەكێ مەزن تر بۆ پەیڤێ داكو پەیف بكاریت پێتریا هێمایان بدەت . دبێژم نویكرن نەك (( نویخازی )) ، ڤێ چەندێ ژی دێ دخالەكا دیدا ڤەكولینێ لسەر كەم ... دەما من ئەڤ هوزانە بۆ جارا دوویێ خواندی من دگەل خوە ب دەنگەكێ بلند خواند (( چونكە دجارا ییكێ دا من زانی كو هوزانڤانی هوزانا خوە لسەر سیستەمێ برگەیان نەنڤیسی یە )) داكو بزانم هوزانڤانی چ بكارئانیە دئاڤاكرنا موزیكا هوزانا خوەدا ، بو من خوەیا بو كو هوزانڤانی ریتم ((ئیقاع )) و موزیكا ناڤخویی و موزیكا رستەیا كلاسیكی بكارئانیە .بو نموونە دڤێ هوزانێ دا ئەڤ پەیڤە بكارهاتینە ل دویماهی یا هژمارەكا رستەییێن هوزانێدا (( گەل ، گەل ، مەشخەل )) یان ژی (( نەبوون ، سەرخوەبوون ، پێشڤەچوون )) ئەڤ چەندەژی هوزانێ ژ نویخازیێ دویر دئێخیت چونكو بشێوەكی راپورتی راستەوخوە هاتیە نڤیسین .

لێدان ژی وەكو رەخنەگر( فاضل یامر) (٤) دبێژیت، ژ پەیڤەكا یونانی (گریكی) هاتییە، ب رامانا ژۆرداچوونێ (جریان)، لێدان ژی ب رەنگەكی گشتی دویف هەبوونە دناڤبەرا دوو ئاوایاندا مینا (دەنگ و بێدەنگی،تاری و روناهی، كورتی و درێژی) ئەڤە ژی ساخلەتەكا هەڤپشكە دناڤبەرا تەڤ هونەران دا. لێدان ژی یەكە ژ ستوینێن گوتارا

هوزانیٚ، بەری نهەژی (ئیفلاتون)ی گرنگی یا ریتمیٚ وەك ستوینەكا بنەڕەتی، ژ ستوینێن هوزانیٚ دكومارا خوەدا دیار كریە.. چاخیٚ گوتی هوزان لسەر (۳) سیٚ ستوینا دهێتە ئاڤاكرن ئەوژی ئەڤەنە: (پەیڤ،ژێكئینان،ریتم)

هوزانا(پێشمەرگە) ب دوو لڤینا دهێتە خوەیاكرن یەك بەرەڤ پەڤینا وێنی هوزانێڤە دچیت و دكەتە (شظایا) ساچمەیێن پرت و بەلاڤ لیٚ هەڤدو دگرن مینا:

(پیٚ بەند..پێشمەرگە..باران)

(سوز.. باوەری..بەرخوەدان)

لڤێرەدا دبینین كانیٚ چ پەیوەندی هەنە د ناڤبەرا ڤان پەیڤاندا.. ب هزرا من دوو پەیوەندی هەنە،ئەوژی ئەڤەنە:پەیوەندییەكا وەكهەڤی یانكو پەیڤەك یادی پەیدا دكەت یان ژی یەك دەبیتە(ئەگەر) و یا دی ژی دبیتە (ئەنجام)، بو نمونە (پیٚ بەند) هەڤدژا پەیڤا (پێشمەرگە) یە،(پێشمەرگە) ژی وەكهەڤا (باران)ە،یان ژی سوز،(باوەری) دبنە بەرخوەدان،جارەكا دی(پێشمەرگە) دبیتە نیشانیٚ بەرخوەدانیٚ ئەو ژی ئەنجامیٚ چەوساندن و ( پیٚ بەندی)ییێیە. ئەڤجا تەڤ هەڤدوو دگرن. هوزانڤانی ئەڤ پەیڤێن هەژی نە ب نەزانین و بیٚ دەستی دانابنە.

ئەڤجا گەرەكە خویندەڤان نە نێریتە ڤان پەیڤان كو ب تەنیٚ هاتینە ژبوٚنا جوانكارییٚ،بەلكو بەریٚ خوە بدەتە ئانكو رامانێن پشتا پەیڤان و پەیوەندی یێن دناڤبەرا واندا پەیدا بكەت.

لڤێرە پەیڤ ل دویف ئامرازێن پەیوەندی یێن دناڤبەرا خوەدا دگەڕهن،پەیڤ ژی نیشان و رامانان برێکا جهێ خوە دهوزانێدا وەردگریت مینا هەر پارچەك ژ پارچەیێن شەترەنجێ، بهایێ خوە وەردگریت ژ جهێ خوە لسەر چارگوشەیا یاریێ.

لڤێرە پەڤینا پەیڤا روی ددەت و ژ رامانا خوەیا فەرهەنگی دەردکەت و هەژمارەك دی ژ رامانان ددەت درستەیا هوزانێدا. ئەڤە ژی داخازیەکە ژلایێ هوزانڤانی ڤە ژ بو پشکداریا خویندەڤانی دڤاڤارتنا هوزانێ ورێخستنا هوزانێ،هەر وەکو رخنەگەر و هوزانڤان قوچان دبێژیت ( لڤان دوماهیا رەنگەکێ دی یێ وێنەگرتنێ هاتیە گوڕێ ئەو ژی پالدانا پەیڤەکێ بتنێ وەك وێنە و دویف ئێك خستنا گەلەك وێنەیا و رێ بدەتە خوەندەڤانی کو وان پرتا دهزرا خوەدا لێك بدەت(٥). لڤێرێ ژی وێنەیێ هوزانێ دهشێ خویندەڤانیدا پەیدا دبیت وئەز باوەرم دێ تشتەکێ نوی ئینتە ڤە.

بەلکو ژی نەك دبێژن ئەڤ هوزانە دکەڤیتە دەرڤەی بازنا نوخازیێ چونکو تایتلێ هوزانێ(پ.م) ڤێ چەندێ دهەلوەشینیت و ماندەل دکەت و رێکێ ل بەرسینگێ خوەیندەڤانی دبڕیت و ددانتە بەرامبەر تشتەکێ گرتی هەر وەکی رخنەگری نیوزلەندی(ستید) دبێژیت(ئێك ژ ساخلەتێن هوزانا نوخاز ئەوە یا ڤەکریە و گەلەك رامان ژێ دچن) (٦).

دێ شێین بێژین هوزانا(پ.م) لرەخ و روییێن نوخازیێ دزڤڕیت.

لێ مە دڤێت بێژین کو ئەڤ رەنگێ هوزانێ یێ نویە وەکو قوچان دبێژیت لێ نە د تۆرێ جیهانیدا، بەلکو بتنێ د تۆرێ کوردیدا.

نڤیسەرا فرەنسی (سوزان برنار) سەبارەت ڤی بابەتی دپەیڤیت, هەروەسا هوزانڤان(والت وێتمان) مفا ژ سیستەمێ ریتما ئنجیل و تەوراتێ وەرگرتیە، دیسان هوزانڤان ( مزرڤان) دبێژیت (من مفا ژ نڤشتوکا ئاڤێستا یا زەردەشت وەرگرتیە).

هوزانڤان (ئەزرا پاوەند) پشتی خواندنا هوزانا چینی و ژاپۆنی گەهشتە هندێ کو چێ دبیت هوزانا چینی بەرهەمێ زنجیرەکا وێنەیێن هوزانێ یە یێ کو پەیوەندی دناڤبەرا وان دا هەبیت.

درێژا سێ یێ دا ژ وێ هوزانا چینی یاکو (پاوەند) ی وەرگێرای لژێر تایتلێ( بەهیا زێرەڤانا سنووری) دێ ڤان پەیڤان بینن ( دار.. وەریان..پایز.. گیا.. زەر )

رامانا ڤان پەیڤان ژی هەر وەك (ڤینولوسا) دبێژیت:

ل وەرزێ پایزێ گیا زەر دبیت و بەلگێن دارا دوەریێن.

وەسا بۆ (پاوەند)ی خویا بو کو هوزانا چینی هەردەم پەیڤێن سەرەکی(وێنەیان) پێش کێش دکەت .

بێی کو تشتێن دن یێن زمانی مینا ئامرازێن پەیوەندیا و پروپوزێشن(احرف الجر) و تا رادەکی ژی فەرمانا بکار بینن

ئەڤە ژی وەك (پاوەند) دبێژیت:لەزی.. کورتی.. ئابووری.. کونکریتی..وهاندانا هزری لسەر هوزانێدا بەلاڤ دکەت (٧) .

ئەڤجا لدویف تێگەهشتنا من ژ نویخازی یا ئەورووپی ئەڤ هوزانە(پێشمەرگە) دکەڤیتە دەرڤەی خانا نویخازی یێ.

لێ وەسا دیارە هەڤالێ هوزانڤان (هزرڤان) یێ لدویف نویخازیەکا خۆمالی دگەڕهیت وەك پێدڤیەکا بابەتی ب وەرگرتنا مافێ ژ هنەك ساخلەتێن نویخازی یا روژئاڤایی بێی پشتگوهـ ئاڤێتنا کەلتوری مە یێ کەڤن ( کو تا نها گەنجینەکا سەر موهرە ) داکو ب بیتە ژێدەرەکێ سەرەکی و تەڤاڤکەر ژ بو نویخازییا مە.

ل ڤان دوماهیان ژی (کۆما هەڤچەرخ) یا هوزانێ ل دهۆك و ئاکرێ ژی گەهشتنە ڤێ راستی یا من گوتی، نەمازە ل دهۆکێ.

ئەڤ دوو خالێن ژێری ژی ڤێ چەندێ دسەلمینن:

(١) سالا (١٩٩١)ێ دەستەکا هەڤچەرخ گوڤارەك بناڤێ ( نویخازی) دەرئێخست،لێ ئەڤرو دبینین کو نڤێسینێن خوە بناڤێ ( کۆما هەڤچەرخ ) بەلاڤ دکەن و لژێر تایتلێ ( نویکرن هەر و هەر).

(٢) هوزانڤانێن ڤێ کۆمێ کو(هزرڤان) بێك ژوانە ئەڤرو پتر ژ کلیلەك و دەرفەتەکی ددەنە خویندەڤانێ هوزانێن خوە ژبۆنا پشکدارییا وان بکەت.

هەروەسا ڤان هوزانڤانان بەرێ خوە دایە داستانێن رەسەن یێن کوردی ژبۆنا وەرگرتنا مفایەکێ مەزن, و ئەم ب ڤێ چەندێ دگەهینە ئەنجامەکێ .. ئەو ژی ئەڤەیە:

هوزانڤانێن (کۆما هەڤچەرخ) تا نهو باوەری ب رۆلێ هوزانێ یا گوهرینکار هەیە .

لدوماهیێ دبێژین: رێکا نویکرنی رێکەك سەختە مینا تەڤ رێکێن پێشکەفتنێ .

## ژێدەر و پەراوێز

(١):بنێرە گوڤارا(پیرس) یا مەلبەندێ رەوشەنبیری ل ئاکرێ هەژمارە(٣) هوزانا پێشمەرگە/هزرڤان.

(٢):جاکوب کورك– اللغه فی الادب الحدیپ،الحداپه و التجرید ص١٦٢.

(٣):مجله الشعر العدد(١٤) ص٨٢ .

(٤):گوڤارا (نوخازی) هەمارە(٢) ل(٢٥).

(٥):مجلة الثقافة الاجنبية العدد (٤٣).

(٦):دەستخەتەکا وەرگێرای ژ زمانێ ئنگلیزی ژ لایێ هوزانڤان (شەمال ئاکرەیی).

(٧):گوڤارا (مەتین) هەژمار(٣٦) بنێرە هوزانێن هوزانڤانێن هەڤچەرخ (سەلمان کوڤلی) و (ئەمیر فندی).

# تەرم دەوزانا
# (مالئاڤاهی یا ئەلهوی) دا

شعر : شەمال ئاكرەیی

مالئاڤاهی یا ئەلهوی

سەما، خەون، هاڤیبوون،

سێپێكا تەژی كەنی و روندك و ؟

نها دەمێ دویركەفتنێ یە

دا نڤێژەكا دی بەرەف ژێهەل

ل سێدارێ بدەین

تاكو سوبەهی و

ئەو روژا دویڤ دا

هندەك شیرینی یێ

بكەنە باران،

مە دناڤ پەرێن پەنجەرێن تاری دا
سەقا بکەن،
ئەنتیکخانا ژ مەسل بکەن!
ئاخ!
بو وی ئاگری دویّ ژورا تەنگ دا،
دەمیّ کوخێن و
پشت خویکی یا پیرەژنان...
ئەڤران وەکی سەیێن هار،
ل بازارێن دیلا دفروشن و
ب وی مژا پیڤازی بای دسمن
مە دکەنە ...
سەنگەرەکیّ هەرفتی،
بەهیدارێن زیندی یا...
ب سەما دئێخن،
ئەز نامینم ئەز
تو ژی هەر بەفری!
ها... ئەڤە...
چاڤێن ئەلهوی،
ژ ڤەخارنا خوزی یان
هێشتا دگێژن.
ئەڤە نە سەمایە
بەریّ من نەگورە ...

ژ وەرگرتنا پاداشتێن شکەستنێ،
جارەکا دی...
ژ نەدیتنا تەڕا ((چریو)) !
گڤاشتن و کەلا حەزێ
ئەم دگەهاندین ستێرا
دو پارچەیی یا خو مە دبوهوژاند
ئەو گلوپێ ل هنداڤی مەژی
دهات و دچوو
وەرە بو تە ب بێژم:
ئەو رێکا ...
من و تە ئەڤرو پێکڤە
بێ ی تە... بڕی،
هەمی خازگینی یێن تە
دکرنە مێهڤانێن من!
ئەز دبوومە زارویەکی دای بەرزە
دگەهشتمە تە و...
تو مژەکا بی رەنگ
سێبەرا تەژی
گەلەکا بێ ئوختوبار بوو
روندکێن من
نە دکارین ب هەژینن،
بلا دلێ تە بتنی...

نەرمى يا ئێك تبلا تە هەبا
داكو ل روژا مالئاڤاهى يێ
چاڤێن من
دبياڤا بيناهى يێ دا
وەكى من
ببان تەرم .

هولەندا ١٩٩٨/٤/٥

پێشنيار : پەيمانەك دناڤبەرا دل و تبلا بهێتە بەستن و ( دل ) نەرميێ ژ تبلا وەربگريت ...

تەرم : يان خوڤەكێشان ، قايلبوون ب جهێ بينەرى يان پرسيارەكا ڤەكرى داخازا دەستپێكەكا نوى ژبو جهێنانا ئەو مەرەمێن وى باوەرى پێ هەى و نەشيا بجه بينيت ، لێرە تەرم يێ هەڤدژە دگەل مرنێ و نەيێ رويسە ژ ئەزموونا ، ئەڤ تەرمە ئەوێ داخازا بوهژتنا هەڤدژان دناڤ سێپێكێ داكرى، يێ ل دويڤ ناسناما خوە دگەريێت ، يێ ل دويڤ رامانا هەبوونێ وبهايێ نەهەبوونێ دگەريێت ، پێشنيارە بو پەسەندكرنا پەيوەنديەكا نوى پشتى پروسا هەلوەشاندنێ ب دوماهى تێتن و ئەڤ پەيوەنديا نوى بێتە ئاڤاكرن لسەر بنەرەتێ ماڤێ هەبوونا جياوازيێ .

ئەڤ تەرمە ژلايێ دەرونى ڤە يێ ساخە ، وەها تێ دگەهم كو وى دڤێت ل تێگەهێن مەيێن چاڤلێكەر بو ژيانێ ، دهاڤيبونێ و سەما ... هتد دەربكەڤيت .

رامانا هەبوونیێ ببیتە پرسیارەك دقەیرانیێ دا ، لەوماژی دیێ بینین کو تەرم دیێ بیتە دیتن ,زێدەگافی, گوهرین و گەریان لدویڤ تشتیێ نەهاتی ، لەوماژی دهوزانیێ دا دەم دەمەکیێ ڤەکریە :

**نها دەمیێ دیرکەفتنیێ یە.**

ئەڤ دەمیێ ڤەکری دیێ مینیت ب مەرجیێ لێدانا پیروزییێ و پێنگاڤێن بوێر ژ بو ئەنجامدانا پروسا ئاڤا کرنیێ و دبێژیت :

**دا نڤێژەکا دی بەرەف ژێهەل ... ل سێداریێ بدەین .**

نها ئەم یتین هەمبەر رستەیەکی هەلبەستی، دڤیێ رستەییێ دا لادان و ڤاری بوون هەیە، لێدان نەب تنیێ درمانی دا، بەلکو ل پشت دا لێدانەك یان پرۆژەیەك هزری و جڤاکی هەیە.

ل ڤێریێ ئەڤ لێدانە مەرجە ژ بو ب جهئینانا ڤان حەز و گوهرینا بەرەف ئاسویەکیێ ڤەکری (ژێهەل).لیێ ئەڤ لێدانە بەردەوام نابیت دڤی دەقیدا، چونکو هوزانڤان دهێت سنورەکیێ بو ڤیێ لێدانیێ دانێت، ڤیێ پروسیێ و بەردەوام بینا وی ب بجهئینانا هنەك ئارمانجاڤە گرێددەت:

**تا کو سوبەهی و**
**ئەو روژا دی ددیڤدا**
**هندەك شیرینییێ بکەنە باران.**

ب رامانەك دی هەر دەما ئەف گوهرانکاریە هاتنە رویدان لێدان ژی دیێ هێتە راگرتن. ل ڤێرە جارەکا دی دیێ کەڤیتە ژێر دەستهەلاتداری یا هنەك پیروزیێن دی، یان ژی دروشمێن نوی.

دیسان هوزانڤان سنوورەکیێ دی ددانێت بو پرسا ئاڤەدانکرنی ل سەر بنەرەتیێ جیاوازییێ، دەما خو دکەتە نموونە و دبێژیت:

**داكو ل روژا مالئاڤاهيێ**
**چاڤێن من**
**دبياڤا بيناهيێ دا**
**وەكى من**
**بيان تەرم.**

ب ڤێ چەندێ ژى و هەر چەندە تەرم دبيت رەنگەك بيت ژ رەنگێن خەونا يان ژى سەمايەكا ئاشوپى بيت و هاڤيبونەك نوى بيت، لێ دەما دبێژيت (وەكى من) ديار دبيت كو هوزانڤانى نموونێ خويێ بەرهەڤ هەيە،چونكى خو دكەتە نموونە (ئەزموونا خو). ب رامانەكا دى خويندەڤانى پتر ب خوڤە مژيل دكەت (هوزانڤانى) ناهێليت وەرگر ل بياڤێن دى دناڤ دەقيدا بگەرێت.

من گوت نموونێ خويێ بەرهەڤ هەيە، ب ڤێ چەندێ ژى دێ پروسەكا دى يا دووبارەكرنێ هێت ئەنجامدان، ل ڤێرە فشارا هزرا دەستهەلاتداريێ دناڤ ناخێ هەر مروڤەكيدا يا زالە, ل ديڤ ديتنێن من هێژ مروڤ نەشيايە تا ديماهيكێ يێ ديموكراتى بيت .

مروڤ ل وى دەمى دێ كارێت بەردەواميێ ب پرسا ئەفراندنێ و هەلوەشاندنێ بدەت، دەما چ نموونێن خو يێن بەرهەڤ نەبن و خو ب خودانێ چ دەقان نەزانيت ، ئەو دەقا ئەم دنڤيسين دەما ب ديماهيك هات پێتڤى يە مروڤ خو ژێ دوير بێخيت، ب رامانەكا دى بەرەڤانيێ ژێ نەكەت ئەگەر زانى كو هنەك هزرێن دى هاتنە گورێ... كاريگەر و نويترين ژ هزرێن نڤيسەرى ئەوێن دناڤ دەقا خو ئاراستە كرين ،

هوسا کارێ رەخنەیی دگەهیتە ئاستێ هەلوەشاندنا بێ سنوور، رەخنە نە ب تنێ ل وان هزران دهێتە کرن ئەوێن مروڤ ژێ نەرازی، بەلکی ئەو هزرێن مروڤ ژێرازی ژی بێخیتە بازنێ رەخنێ و گومانێدا، چونکی هەر چەوا بیت هنەك هزرێن دی هەنە هێش نەگەهشتینە مروڤی پێتڤی یە مروڤ ل دیف بگەرێت ، و دڤێ گەریانێ دا دێ بسەر هزرێن نوی و زێدەگاڤی هەلبیت، ل دویف دیتنێن من هوسا پروسا ئافرندنێ و نویخوازیێ دهێتە ئەنجامدان، و ئامراز ژی بەرێخودانێن رەخنەیی و قایلبوون ب جیاوازیێ، چونکو رەخنە هێجەتا بەردەوامبوونا خوّ ژجیاوازیێ وەردگریت هەر وەکو دکتور مالك المگلبی دبێژیت، دیسان دکتور عبدالسلام المرشدی دبێژیت: جیاوازی پرسیارا پەیدا دکەت و دەق دێ مینیت ب جیاوازیێ پرسیارەك د قەیرانێدا و دێ یا ئاڤا کری بیت ل سەر دوو دلیێ و هوسا ژی نڤیسەر نابیتە پابەندی چ دەقا یان ژی خو ژ دەقی بلندتر دبینیت ئەگەر ڤەزڤرینە دەسپێکا هوزانێ و رستا وێ یا یێکی:

**سەما،خەون،هاڤیبوون**

و گرێدەین د گەل ئەنجامێ دنەخشیدا دیار (تەرم)دێ کارین ڤێ سێ گوشێ دروست کەین:

بەری نهو مە گوت داکو ئەڤ لێدانە یا بەردەوام بیت پێتڤی ب سێدارەدانا پیروزیێ یە ئەڤا لێدانە هاتە ئەنجامدان، لێ تا دیماهیکێ یا بەردەوام نەبو چونکی پیروزیەك دی پەیدا بو.

دا روناهیێن خو بەردەینە سەر رستەکا دی یا هوزانێ ئەوا دبێژیت :

مه دناڤ پەڕێن پەنجەرێن تاریدا
سەقا بکەن
ئەنتیکخانا ژمە سل بکەن!
ئاخ!
بو وی ئاگریٚ دویٚ ژورا تەنگ دا.

ئاگری پیٚتڤی ب جهی هەیە، هەر چەندە ئەڤ ئاگریٚ دناڤ ڤیٚ هوزانیٚ دا جهیٚ ویٚ فرەهترە ژ کوچکیٚ و بخیٚرییٚ، لیٚ هەر ئەو جه ییٚ مای چارچیڤکری (ژورا تەنگ) و هوسا بزاڤ و سەرهەلدانیٚن گەلیٚ کوردستانیٚ هەر چەندە ژێدەریٚن هیڤی و داخازیا بوون، لیٚ هەر ییٚن چارچیڤکری بون و دبیاڤەکا نەیا بەرفرەهدا لڤین دکر.

ژن ژی مینا وی ئاگری ژێدەرا گەرماتییٚ و تەناهییٚ و ئومیٚدایە و دڤی دەقی دا ژی ژن پیرەژنە مینا ئاگریٚ چارچیڤکری دویٚ ژورا تەنگ دا، لەوما ژی پەیڤا (ئاخ) یا دبەراهیکا ڤیٚ رستیٚ دا هاتی وەکو نیشانیٚ کەسەر و کوڤانییٚ و پەنجەرە ژی مان تاری ، هەر چەندە پەنجەرە ژێدەریٚ وەرگرتنا روناهییٚ یە و دەریەکە بو دیتنیٚ، لیٚ دیٚ مینیت دیتنەکا لاواز و هیڤی ب بارانەك دی هەیە کو دناڤ ویٚ بیٚزارییٚ دا بیٚنە بەرهەڤکرن ژبو ب جیٚئینانا ئارمانجەك مەزنتر (سەقا بکەن).

← ل ڤیٚرە سیٚ جەڤەنگیٚن دی هەڤدوو دروست دکەن پەنجەریٚن تاری ← ژورا تەنگ ← پیرەژن ئەڤ سیٚ هیٚمایە نیشانیٚن کیٚم ئومیٚدییٚ نە لیٚ دکارین بیٚژین نیشانیٚن بیٚزارییٚ و بیٚ ئومیٚدییٚنە، چونکو هەر چەندە پەنجەرە دتارینە، لیٚ هەر دیٚ وەکو ژێدەریٚ روناهییٚ و دیتنیٚ بن، دیسان ژورا تەنگ نیشانیٚ هەبوونا جهییە هەر

چەندە جھەکە بێ سنوور کرییە، لێ ب هیڤی یە کو ئەڤ ژورە بەرفرەھ ببیت و ئاگر((شورەش و گوهرین)) د بیاڤێن بەرفرەھتردا بەلاڤ ببیت، و پیرەژن هەر دێ ((مێ)) مینیت نیشانا ئاڤزایی و تەناهی و هێمنییێ، لەو ما ژی هوزانڤان دهوزانا خودا خویا دکەت کو نهو گاڤا لێدانا پیروزیایە و دەمێ دویر کەفتنێیە ژ هەمو بیر و بوچوونێن بووینە ئاستەنگ یان ژی بووینە ئەگەرا چارچیڤکرنا ئاگرێ دژورا تەنگ دا, هەلبەت دەما ئەڤ کارە تێتە ئەنجامدان د زنجیرەکا بەرسڤ و نەرازیبوونا دگەلدا هەڤ جمك بن و دبیتە ئەگەرا ڤەقەتیانێ دگەل هزر و بیرێن بەرێ ، هوزانڤان ڤێ چەندێ سروشتی دبینیت و دبێژیت:

ئەنتیکخانا ژمە سل بکەن.

هەر ئەو ئەنتیکخانەنە ⟵ ( هێمایێ بیر و بوچوونێن نەگونجای دگەل دانێن سەردەمی یان ژی ئەو هزرن یێن چارچیڤکری) ئەوێن بووینە ئەگەرا چەندین کارەساتا و ئەم کرینە سەنگەرێن هەرفتی و بەهیدارێن زیندییا مینا د هوزانێ دا هاتی.

ل دیماهیکێ دێ بێژم ئەڤە خوندنەك بو دڤێ هوزانێدا و ئەز دوێ باوەرێ دامە کو ئەڤ هوزانە دێ کاریت چەندین خوندنێن دی هەمبێز بکەت، چونکو ڤالاتیەکا تێدا هەی و خوندەڤانێ دووێ و سییێ دبیت ڤالاتیەك دی بو ب بیتە خالێن دەسپێکرنێ و ب تێکرا دێ کارم بێژم جهێ جودا یێ دڤێ هوزانێدا هەیە •

# جە و جڤاکێ ڤەدەر

## خواندنەك د چیرۆکا "ئوکرانیا بچویك" دا

دبیت گەلەك ئەگەر هەبن ئەم پالدابین ڤێ چیروکێ پتر ژ جارەکێ بخوینین ل دویف دا ل سەر ب پەیڤین ، لێ جە ئێکە ژ ئەگەرێن هەرە سەرەکی و کاریگەر د ڤێ پالدانێدا دەما مە ئەڤ چیرۆکە خواندی جهێن وێ مرۆڤ ڤەدگێرا بۆ زاروکینیێ، چونکو د ڤان جها دا نەمازە، (( مقێم )) کو جهێ سەرەکیە د ڤێ چیرۆکێدا من زاروکینیا خوە تێدا بوراندی یە و دەما نڤیسەر (ئەمین بوتانی) ئەڤ چیرۆکە دخواند د ئێڤاریەکا چیرۆك خواندنێ ل ئاکرێ، من هەست دکر کەسێن ڤێ چیروکێ هەمیا دناسم، و "حەجی سلو" کو ئێکە ژ کەسێن چیرۆکێ ئەز باش دناسم د کولانێن ڤێ بازارێ بچویك و

بەرتەنگدا و من چەند یاری دگەل کوریٚ وی کرینە و هندی بێژی شەڕ ژی مە یێن دگەل کرین، و تا نهو ژی دبیت مرۆڤ هەست پێ بکەت کولانێن ڤی بازاری مرۆڤی بۆ خو دکێشن.

جهـ وەکو رەگەزەکێ سەرەکی ژ رەگەزێن بنیاتی یێن چیروکێ، چێ دبیت هەر وەکو رەخنەگریٚ عیراقی (( یاسین ئەلنەسیر )) دبێژیت : (( دیروکەکا درێژ بخوەڤە بگریت )) (١) و هنەك جاران ژ جهـ سەری ژ هەمی رەگەزێن دی ژی دستینیت و دبیتە قەهرەمانێ رەگەزێن چیرۆکێ .

چیرۆکا (( ئوکرانیا بچویك )) (٢) یا نڤیسەر (( ئەمین بوتانی )) ئێکە ژ وان چیرۆکا ئەوێن پویتەکێ بەرچاڤ دایە جهی، تێدا جهـ دبیتە قەهرەمانێ چیروکێ و رەگەزێ سەرەکی،و رویدانێن ویٚ ل سەر هاتینە ئاڤاکرن، و جهـ تێدا بوویە قەوارەکێ مەزن و هەمی رەگەزێن دی (( کەس، دەم،رویدان .. )) لدۆر دزڤڕن .

د ڤیٚ چیرۆکێدا، چیرۆکڤیسی جهـ ب کار نەئینانە وەکو مەیدانەك رویدان ل سەر بێتە ئەنجامدان، بەلکو جهـ یێ بوویە چێکەریٚ رویدانێ، و دناڤ ڤیٚ چیروکێدا جهێ چەندین رامانێن دیروکی و هێماییێن میسولۆژی بخوڤە گرتینە.

چیرۆکنڤیسی چیرۆکا خوە ژ گوندی دەست پێکرییە (( ل دەمێ لاوێن گوندیٚ مە ئەوێن ناڤیٚ وان بۆ عەسکەرییٚ دهات، دگەل کاروانێ گوندی ب سەر بەردەرەشی را خوە دگەهاندنە وی بازێریٚ هەتا نەگەهیە هنداڤ دیار ناکەت .. )) رویدانێن چیرۆکێ بەرەڤ بازێری دبەت و خوە دهاڤێژتە کویرترین جهـ دناڤ بازێڕیدا . (( .. گوندیێن

مه چ جارا بۆ كڕین و سویك و بازاڕا هاتبانه ئاكرێ و زڤڕیبان بەحسی هەرتشتەكی كربان، بەحسی مقێمێ نەدكرن... )). ئەڤ جهێ كویر (( مقێم )) ب درێژاهیا ڤێ چیڕوكێ دبیتە قەواره و هەمی كەس و رویدانێن چیڕوكێ لدوّر دزڤڕن، و ئەڤ قەوارەیە مەزن دبیت و هەمی جهێن دی، رامانا هەبوونا خوە یان ژی گرنگیا خوە ژ وی جهی وەردگرن، و دگەل رویدانێن چیڕوكێ ئەڤ قەوارە مەزن دبیت، تاكو نە ب تنێ ئاكرێ بەلكو جیهان ب تەڤرا نەشێت ل داڤێن وی جهی رزگار بیت (( .. ئەز پشتڕاستم كو توخیبێ مقێمێ نە هند ساناهێیە بهێتە پیڤان، مەسەلە گەلەك ژ ڤێ هندێ مەزنترە وەكی ئەم بەرێ خوە ددەینێ.. )) د ڤێ چیڕوكێدا بەری هەر هزرەكێ، چیڕوكنڤیسی داخباری و كارتێكرنا جهی ل سەر ناخێ مروڤی ددەتە خویا و بەرچاڤكرن، و د ڤێ نەخشەیێدا ئەڤ چەندە دیار دبیت :




((... پا ب خودێ خوش بو، وەختێ کچێت گوندا دهاتن،مە خوە د قوتا ناڤ شولخێدا، هەتا تەزیەك ب گیانێ مە داهاتبا، ژ ئارەقێ رەش و شین دبووین...)) و ئەڤ خوەشیە هەر وەکی دیار خوەشیەکا سێکسییە،و دیسان دەما ئەڤێ خەونێ ژی بخوینین، هێماییێن وێ شلوڤەکەین دێ بینین سێکس و بەرژەوەندییێن ئابووری و پەرستنێ، عەقلێ ڤی مرۆڤێ رۆژهەلاتی داگیرکرییە، د خەونێدا هاتیە: ((.. حەجی سلوی مەسینێ خوە ئینا دەرڤەی دوکانێ و دەستنڤێژا خوە شوشت و شەملکا نڤێژێ رائێخست، نیڤا شەملکێ د ناڤ دوکانێ بو و نیڤا دی ل دەرڤەی دوکانێ بوو..)).

دوكان: جهێ بازرگانییێ

نڤێژ و شەملك : پەرستن

هەرچەندە دوكانا حەجی سلوی زۆر یا نێزیکی مزگەفتێ بو ئەگەر نەبێژین دیوارێ دوكانێ و مزگەفتێ یێك دیوار بو، لێ حەجی سلوی دوكانا خوە نەدهێلا و نڤێژا د دوكانێدا دکر، ب رامانەك دی کڕین و فروتن و بازرگانی ژ پویتەیێن وی یێن هەرە سەرەکی بوون و دەما هەر دوو جینێن مەچێترا ل دوكانا حەجی سلوی گەهشتینە یێك هەر وەکی د چیروکێدا هاتی، حەجی نەدڤیا چ هەلویستا وەربگریت یان ب رامانەك دی نەدڤیا بەرژەوەندیێن خوە یێن ئابووری قوربانییێ پێ بدەت، و ئەڤ رەوشت و خوەڤەدەر کرنە رەوشت و عەقلێ بازرگانییە، و ئەڤ هێمایە پتر بەرچاڤ دبیت دەما هەر دوو جینێن مەچێترا هەڤرکیا خوە برینە نە ب تنێ ناڤ دوكانا وی دا بەلكو هەڤرکیا هەر دوو لایەنا (( مەچێترێن خێر و شەڕا )) گەهشتە سەر شەملکا وی یان پیروزیێن وی ژی کەفتنە د مەترسیێدا و حەجی یێ بەرهەڤ نەبو بەڕەڤانییێ ژ ڤان پیروزیا ژی بکەت .

دیسان د ڤێ خەونێدا هاتیە کو : (( .. شەملکا حەجی سلوی د نیڤەکێدا دڕیا و بوو دوو پارچە... )) و (( .. حەجی سلو و کوڕێ خو ژ ناڤترەنگێ بوونە دوو قەد ...)) و (( .. دەما گێلەشوکا مەچێترا ڤەڕەڤی و سەروبەر وەکو خو لێ هاتەڤە و دنیا تەنا بو، حەجی سلو رابو هەر دوو پێ یێت کوڕێ خو هەلگرتن و وەکی کاسپەری بخوڤە نان ...)) لێرەدا پویتەیا سێیێ دیار دبیت کو پویتەکا سێکسییە، حەجی سلو داخوازا وی ئەو بوویە کو ژ لایێ

سێکسیڤە خوە نوی بکەتەڤە،دیسان خاپاندن و فند و فێل و دەستپێسیا وی دگەهیتە گوپیتکێ، دەما حیلێ ل کورێ خوە دکەت. هەروەها دیار دبیت کو ئەڤ مرۆڤە یێ تێهنیێ سێکسییە و د لاوینیا خوەدا ژ لایێ سێکسی ڤە تێر نەبوویە، هەلبەت و هەر وەکو مە گۆتی جهێ رۆژهەلاتێ و رەنگێ کارێ کارتێکرنا خوە ل سەر کەساتیا وی کرێیە.

چیرۆکنڤیسی هەر وەکو بەرێ نهو مە گوتی جه ب کار نەئینایە وەکو مەیدانەك ب تنێ رویدان ل سەر بێنە ئەنجامدان بەلکو پویتەکا زێدە یا ب جهی دای، و دیار کرییە کو جهێ کارتێکرنا خوە هەیە ل سەر پروسا چەوانیا هزرکرنێ ل جەم کەسێن خوە و جهێ سەرەکی د ڤێ چیرۆکێدا (( مقێم )) ە. جهێ بازرگانییێە ل بازێرەکێ بچویکێ رۆژهەلاتی. کرین و فروتن کارەکێ سەرەکی و بێ هەڤرکە، و جڤاکێن ڤان بازێرا ژی جڤاکێن ڤەدەرن، و هەردەم کەس د ڤان بازێرا دا یێ ڤەگرێدایە ب جڤاك و جهیڤە. و هزرا ڤان جڤاکا هزرەکا ەستپێکییە و هەروەکو (( کلود لیڤی شتراوس )) د بێژیت : (( هزرا دەستپێکی هزرەکە یا ڤەگرێدایە ب پێدڤی یێن سەرەکی یێن ژیانێ و تێرکرنا ئارەزوییێن سێکسی )) (٣). هەروەها عەقلێ دەستپێکی یێ چارچویڤ کری و گرێدایە ب چەندین هزر و بیر و رەوشت و تیتالێن گەهشتینە ئاستێ پیروزیاڤە، و وەسا هزردکەن کو ئەڤ هزرێن ساکار دویرن ژ گومانێ، کەس دناڤ جڤاکێن ڤەدەردا کەسەکێ نەوێرە و یێ قایلە ب رەئیا دەسهەلاتدار و دەلیڤا وەرگرتنا هزرێن نوی و هەتا گهورینا رەنگێ کاری ژی تشتەك نە ب ساناهییە و ئەڤ کەسە ب تنێ

دناڤ جڤاكیٚ خوه‌دا هه‌ست ب ته‌ناهییٚ دكه‌ت و دبینیت هه‌ر ده‌ركه‌فتنه‌ك د بازنیٚ جڤاكیدا مه‌ترسیه‌كا مه‌زنه‌ ل سه‌ر هه‌بوونا وی.

لیٚ ل دویڤ دیتنیٚن مه‌، مرۆڤ هه‌رده‌م یێ دابه‌شكرییه‌ د ناخیٚ خوده‌ا ل سه‌ر گه‌له‌ك جها، لیٚ سیٚ جهیٚن سه‌ره‌كی هه‌نه‌ مرۆڤ تیٚدا و دگه‌ل دژیت،جهیٚ ییكیٚ ئه‌و جهه‌ یێ مرۆڤ تیٚدا دژیت (( جهیٚ د ده‌ستدا )) و جهیٚ دوییٚ ئه‌و جهه‌ یێ مرۆڤ لیٚ ژیای ئه‌مازه‌ د قوناغیٚن زاروكینیٚ و سنیٚله‌ییٚدا (( جهیٚ ژ ده‌ستدای )) به‌لكی مرۆڤ بكاریت ڤه‌گه‌ڕیته‌ وی جهی، لیٚ ئه‌و دشیانیٚ دانیه‌ مرۆڤ ب هه‌ستا به‌ریٚ ڤه‌گه‌ڕیته‌ڤه‌، چونكو چه‌ندین گهوڕانكاری ل جه‌م مرۆڤی و وی جهی هاتینه‌ ئه‌نجامدان. و جهیٚ سیٚییٚ ئه‌وه‌ ئه‌ویٚ مرۆڤ دگه‌ل دژیت یان مرۆڤ كار دكه‌ت كو لیٚ بژیت و ژیانا خوه‌ یا مایی تیٚدا ببه‌ته‌ سه‌ر و خه‌ونیٚن هوشیارییٚ پیٚ دبینیت و دبینم ئه‌و یوتوبیاییٚن هنه‌ك فه‌لسه‌فڤانا خه‌ونیٚن هوشیارییٚ پیٚ ددیتن دكه‌ڤنه‌ دڤیٚ خانیٚدا، و ئه‌ڤ جهیٚ سیٚییٚ كارتیٚكرنا خوه‌ یا به‌رچاڤ هه‌یه‌ ل سه‌ر كه‌ساتیا هنه‌ك مرۆڤان و دبینم ئه‌ڤرۆ ده‌ما مودیٚله‌كیٚ جلكا یان بڕینه‌كا پرچیٚ ل ئه‌ورووپا ده‌ربكه‌ڤیت بۆ نموونه‌ و هنه‌ك گه‌نج و لاویٚن مه‌ ئیٚكسه‌ر چاڤلیٚكرنا ڤان مودیٚلا بكه‌ن، وان كه‌سا دڤیٚت ل ئه‌ورووپا بژین و د خه‌ونیٚن هوشیارییٚ دا ل ویٚ ده‌ریٚ دژین و بڤیٚ زراڤه‌كرنیٚ هه‌ول دده‌ن تولڤه‌كرنا نه‌شیانا خوه‌ بكه‌ن و بڤیٚ نه‌خشیٚ خواریٚ بۆ مه‌ دیار دبیت كارتیٚكرن و دابه‌شبوونا مرۆڤی ل سه‌ر ڤان هه‌رسیٚ جهیٚن مه‌ به‌حس لیٚ كری و هنه‌ك جهیٚن نه‌ ییٚن سه‌ره‌كی.




لدۆر جهیٚ ژ دەستدایی هەلبەستڤانیٚ عیراقی (( عبدالوهاب البیاتی )) دەما پەسنا جهیٚ لیٚ پەیدابوونیٚ دکەت و دبێژیت: (( دیٚ شێم بێژم کو تۆڤیٚ یاخیبوون و شورەشیٚ دگەل من ژ دایك بوویە و ب خوین و بەلەنگازیا من و خەلکیٚ دگەل من چاخیٚ زاروکینییٚ و لاوینیا بیکیٚ ژیاین، پێکەهشتینە ))(٤) .

دیسان جورج لوکاش دبیژیت : (( دەما مروڤ ژینگەها خوە دهێلیت ئەڤ ژینگەهە هەر دمینیت ب وی ڤە گرێدایی )) ( ٥ ) .

لەوما ژی دبینین مروڤ بەرەڤانییٚ ژجهیٚ خوە دکەت ، چنکو دوی جهی دا هەستیٚ ب بەهاییٚ هەبوونا خوە دکەت ، و دەما مروڤ

جهێ خوەیێ یێکێ دهێلیت هەول ددەت جهەکێ ئەلتەرناتیڤ پەیدا بکەت و ئەڤە ساخلەتەکە ژ ساخلەتێن هەر مروڤەکی ، خەلکێ ئاکرێ ژی ئەڤ ساخلەتە ل جهم وان زور یا بەرچاڤە و د چیرۆکێ داهاتیە : (( .. و هەکە مقیم جهێ مەزنی و شەهنازی و پویتەپێدانا خەلکێ ئاکرێ نەبا ئوکرانیا بناڤ نەدکر .. )) ئەگەر ژلایێ دەروونیڤە ڤێ ساخلەتێ شلوڤە بکەین دێ بینین جهی گرنگیا خوە هەیە و مروڤ یێ پێڤەگرێدایە و جهێ ژ دەستدایی ( یێ زاروکینییێ ) تایبەتمەندی یا خوە هەیە هەروەکو ( باشلار ) د کتێبا خوە دا ((جوانییێن جهی — جماليات المكان)) پەسنا ئەڤێ جهێ دکەت و دبێژیت : (( ئەو جهە یێ کو گرنگیەکا پرژین هەی ، هەر ئەو جهە وەکو خوە دمینیت، و ئەم سەنتا خەونێن خوە بەرەڤ کیڤە ببەین ، ڤەگەرا یادگارییێن مەیە ، ( جهێ زاروکینییێ ) ئەو جهە یێ کو ئاشوپ و یادوەری ب هەڤرا تێنە گرێدان )) ( ٦ ) .

جهێ زاروکینییێ تایبەتمەندییێن خوە هەنە مروڤ تێدا هەست ب تەناهیێ و دل خوەشییێ دکەت و هەردەما مروڤ ژ ڤێ جهێ دویرکەڤت ، دناخێ خوەدا هەست ب ئالوزییێن دەروونێ دکەت ، و یێك ژ ئەگەرێن ڤێ ئالوزیێ ئەوە مروڤ د جه و جڤاکێن نوێ بو تێتە ڤەگوهاستن هەست ب تەناهییێ ناکەت و باوەرێ ل جهم درووست نەبویە لەوما ژێ مروڤ یێك سەر دوێ جهێ نوێ دا دێ ل جهەکێ گەرییێت هنەك ساخلەتێن جهێ ژدەست دایێ تێدابن داکو خوە ژوێ ئالوزییێ رزگاربکەت و هەتا بکاریت ژیانا خوە یا نوی دگەل ڤی جهێ نوی رێك بێخیت و پەیوەندییەکێ دگەل جهێ تێدا دژیت دروست

بکەت ، ل وی دەمی تاراددەکێ هەستێ ب غەریبی و بەرزەبوونا خوە ناکەت ، لێ جهێ زاروکینییێ هەر دمینیت چێکەرێ دیتنێن مروڤی ، هەروەکو ( باشلار ) دبێژیت : (( ئەڤ جهە ( ژینگەها زاروکینییێ ) گەلەك بوّچوون و دیتنێن مروڤی یێن پاشەروژێ بو جیهانێ پێك دئینیت )) ( ٧ ) .

رەخنەگرێ ئینگلیزی (( جون برجەر )) دەرباری مالێ دجڤاکێن چاڤلێکەر و ڤەدەردا دبێژیت : (( مال دڤان جڤاکان دا هەلگرا هەمی رامانایە د جیهانێ دا ، و مال سەنتەرا جیهانێ یە ، و بتنێ ل مال دا کەس هەستێ ب تەناهیێ دکەت )) ( ٨ ) ، نەمازە دەما مروڤ هەستێ ب مەترسییێ دکەت ، و تەیر دەما هەست ب مەترسییێ دکەت یێکسەر قەستا هێلانا خوە دکەت .

و دڤێ چیروکێ دا ( ئوکرانیا بچویك ) چیروکنڤیس ڤێ هەستێ ڤەناشێریت و ناسناما جهێ خوە یێ یێکێ ، (( ئەو جهێ زاروکینیا خوە یا یێکێ تێدا ژیای )) و هەر ل دەستپێکا چیروکێ دا دیاردکەت کو کارتێکرنا ئەوی جهی ل سەر وی خویا دبیت (( ل دەمێ لاوێن گوندێ مە ... )) و تێد رەخنێ ل خەلکێ گوندی دگریت و ساخلەتێن وی خەلکی ب شێوەیەکێ هەلوەشێنەر د دەتە بەرچاڤکرن (( ... گوندێ گەلەك دل ساف و ساویلکەنە ... )) و هەروەها (( ... گوندی بێت مە ساویلکەنە و ئەز باش مالێ خوە دناسم ، ئەو دشێن بچنە مەزنترین مزگەفت ل هەر وولاتەکی ، بەلێ بو مەسەلا مقێمێ ! چ جارا ئەو دەرهەقی ڤێ قەرقەشێ ناهێن ... )) .

و دده‌ته‌ دیارکرن کو دل ساف و ساویلکه‌یی دگه‌ل دانێن بازاڕی و ئه‌ڤی سه‌رده‌می ناگونجیتن . دیسان ل دویڤ پیڤه‌رێن ژینگه‌ها خوه‌ یا بێکێ‌ په‌سنا بازاڕی و ژیانا بازرگانی دکه‌ت و دبێژیت : (( ... خوزی ئه‌ز گه‌هشتبامه‌ نهێنی یا وێ‌ قانکا نشیڤ و تاری ، ئه‌و جهێ‌ مروڤی ل خودێی دکه‌ت و هشك و ته‌ڕا پێکڤه‌ دسوژیت و خێر و شه‌ڕا تێکهه‌ل دکه‌ت و پیروزی و هه‌ڕمی یا لێك دگوهڕیت .. )) ئه‌ڤه‌ژی ساخله‌تێن هه‌ر قانه‌کێنه‌ بازرگانی لێ‌ تێته‌ کرن (( مقیّم ، شێخ الله ، شورجه‌ .. هتد )) . ل ڤێرێ‌ چیڕوکنڤیس د نه‌هشیا خوه‌ دا ل ڤی جهی دترسیت و داخوازێ‌ ژخه‌لکێ‌ گوندی دکه‌ت کو ژ پیڤه‌رێن عه‌قلێ‌ جوتیاری رزگاربن داکو دوی جهێ‌ نوی دا یان دگه‌ل پێلێن ڤی سه‌رده‌مه‌ی دا بگونجیێن و دڤێ‌ جهێ‌ نوی دا ( بازاڕ ) نه‌ خودان سه‌روه‌ری ببنه‌ خودان سه‌روه‌ری ، ئه‌ڤ ترسه‌ژی تێته‌ رویدان ده‌مێ‌ مروڤ هه‌ست دکه‌ت کو جهێ‌ خوه‌ یێ‌ ل ده‌ست دای هه‌روه‌کو یێك ژ که‌سێن چیڕوکێ‌ دبێژیت : (( .. نه‌ ئه‌م ورجا ئه‌وروپا دده‌ین و نه‌ ئه‌وروپا ورجا مه‌ دگریت ، ئه‌ڤه‌ چه‌ند سال بو گیفکه‌کا مه‌ نه‌بو جنیك و نه‌شیاین دیواره‌کێ‌ ب هه‌ڕفینین و په‌نجه‌ره‌کێ‌ ل شوینێ‌ ئاڤابکه‌ین ، تڤیا ل سه‌ر خوه‌ قه‌بیل نه‌که‌ین ب چینه‌ سه‌ر وێ‌ حازریا ب ده‌ستێت خه‌لکێ‌ هاتبیته‌ چێکرن ، هه‌ر چ نه‌بێژه‌ وه‌ختێ‌ جحێلێن عه‌شیره‌تا هاتبانه‌ ناڤ ده‌سترێژانێت مه‌دا ، مه‌ پێ‌ نه‌خوش بو ، بوچی ، چونکی مه‌ ئه‌و خوشی ب ده‌ستێت خوه‌ و مه‌ بو خوه‌ چێکربوون .. )) .

لێرەدا دیار دبیت مروڤ ب ساناهی دەستی ل جهێ خو تێدا دبینیت دەستهەلاتدار و سەروەری ژێ بەرنادەت . دبیت گەلەك ئەگەر هەبن بۆ هەبوونا ناكوكیێ دناڤبەرا بویك و خەسیێ دا ، لێ جه یێكە ژ ئەگەرێن سەرەكی چونكی خەسی وەكو ئافرەت دەستهەلاتداریا خوە ل ناڤ جڤاكێ یا ل دەست دای و ئەڤ دەستهەلاتدارییا وێ ب تنێ دناڤ مالدا یا مای تا رادەیەكێ و ب تایبەت سەروەری و دەستهەلاتداریا خوە ، د چوارچویڤێ ژورا خوارن لینانێ دا دبینیت ، و دەما بویك دهێتە دناڤ مالێدا و دبیتە ئەندامەك دوێ مالێدا ، خەسی هەستێ ب مەترسیێ دكەت و هزر دكەت كو پێدڤی یە ل سەر وێ بەرەڤانیێ ل جهێ سەروەر تێدا بكەت ، و ئەڤ مەترسی یە دبیتە ئەگەرا پەیدابوونا ناكوكیێ و لەومازی بویك و خەسی د یێك مالدا نەژین دێ پەیوەندی دناڤبەرا وان خوشتر بیت ، جڤاكناس ئیدوار هال دبێژیت : (( جهێ خارن لێنانێ دمالدا ئەو جهە كو دەستهەلاتیا ئافرەتێ لێ موكومە ، و ب شێوەیەكێ گشتی كابانیێن مالا هەستەكا ب هێز ل جەم هەیە ل دور وی جهی ، هەتا وێ رادێ ئافرەت نەشێت ئامانێن خوە ل چێشتخانا كچا خوە بشوت و كچا وێ پێ نەخوش نەبیت )) ( ٩ ) .

## رۆژهەلات .. رۆژئاڤا

هەروەكی ( ئەمین بوتانی ) د نڤیسینەكا خودا دبێژیت : (( ئەڤ هەردوو چەمكە وەكو هێما بۆ پاشكەفتن و پێشكەفتن .. هەستكەرن

ب كێماتی و هه‌ستكرن ب ب خو بلند دیتنیێ .. زۆربوونا بازنێن پیروزیا و كێمكرنا بازنێن پیرۆزیا .. نه‌هێلانا وان .. )) ( ١٠ ) ، ئه‌ڤ هه‌ردوو هێمایه دڤیێ چیرۆكێدا ب ڤی ره‌نگی ناهێته ب كارئینان ، یان نه‌كارئینانه وه‌كو دوو هێمایێن به‌رهه‌ڤكری و كه‌هی ، به‌لكو به‌ری ب كار بینیت یێن رویس كرین ژ ئیماژ و رامانێن وان ، ئه‌وێن د زوربه‌ی نڤیسینادا دهێنه ب كارئینان ، به‌لكو ئه‌ڤ هه‌ردوو سه‌نته‌لدویڤ نه‌خشیێ جوگرافییێ بازێریێ ئاكریێ ب كارئینانه ، كه‌له‌كه‌ڤن دكه‌ڤیته روژهه‌لاتا بازێری و شێخ ماف دكه‌ڤیته روژئاڤا ، هه‌ڤركی دناڤبه‌را ڤان هه‌ردوو هێمایادا هه‌ر د كه‌ڤندا هه‌بوویه ، هه‌روه‌كو د چیرۆكێدا هاتی (( .. ژ مه‌چێترێن خێر و شه‌ڕا هاتن ، ل شێخ ماڤیێ و كه‌له‌كه‌ڤنیێ بوونه زنجیره و به‌ره‌ڤ مقێمیێ تێن ، گاڤ نه‌گاڤ ژی گورمێنه‌ك ب دنیاییێ دكه‌فت وه‌خت نه‌بو گوند و بازێرا ب سه‌رێكدا بینته خار . ژ مه‌چێترێن شه‌ڕی ژ ره‌خیێ شێخ ماڤیێ گه‌هشتنه مزگه‌فتا مه‌زن و ل وێریێ بهنا خوه ڤه‌دان و ژمه‌چێترێن خێریێ ژی گه‌هشتنه نزیكیێ قشلیێ و ل هه‌می ره‌خا وه‌كی كوله‌مێریا به‌ره‌ڤ مقێمیێ ژورداهاتن .. )) ل ڤێریێ هه‌ڤركیا دناڤبه‌را ڤان هه‌ردوو تێگه‌هادا دكارین ب ڤیێ نه‌خشیێ خاریێ جاره‌كا دی دابڕێژینه‌ڤه :

| روژ هه‌لات | كه‌له‌كه‌ڤن<br>شینوار _ دیروكا كوردی یا كه‌ڤن _<br>(( جهیێ هاتیه ژ ده‌ستدان )) |
|---|---|

قشله (( دامودەزگەهێن دەولەتێ ))
سەروەریا یاسایێ _ علمانیەت



مقێم / بازاڕ _ یان کونترولکرنا بازێڕێ _ فاکتەرێ ئابووری



| | |
|---|---|
| روژ ئاڤا<br><br>سەروەریا هزرا | شێخ ماڤ هێمایا پیروزیا<br>زالبوونا هزرا ئەفسانەیی _<br>مزگەفتا مەزن _ دەستهەلاتداریا هزرا یەقینی<br><br>ئایینی و یانەقلی _ ئیوکراتی |

یان روژهەلات و روژئاڤا لدویڤ هەلکەفتا جوگرافیا ئاکرێ

دیسان بەلکی چیروکنڤیسی مفا ژ ئەفسانەو چیڤانوکێن بەرێ ژی وەرگرت بیت ، کو دوان ئەفساناندا هاتیە ، نەمازە ئەفسانێن فیرعەونیا ، روژهەلات هێما روناهی و گەرمی و پەیدابوونێ یە و روژ ئاڤا هێما تاری و ساری و بەرزەبوون و مرنێ و ژیانا دوماهیکێ یە .

ئەڤە يێك ژ خويندنێن من بو دڤىٚ چيرٖوكىٚ دا و مە ب تنىٚ دڤىٚ خويندنىٚ دا جه وەرگرت بو و هەلبەت چەندين خويندنێن دى يێن مايين د رەگەزێن ڤىٚ چيرٖوكىٚ دا و دكارم بێژم هێژ خويندن دجهێن ناڤ چيرٖوكێدا ماينه .

ژێدەر

١–الروايه و المكان _ ياسين ئەلنەسير _ الموسوعه ئەلسەغيره – ٧٥ – سنه ١٩٨٠ وزاره الثقافة –١٩٨٠ ص ٥ .

٢– ئوكرانيا بـچويك – ئـەمين بوتـانى – گوڤـارا رامـان ژمـاره (١٣) سـال ١٩٩٧. لاپـەر( ١٧٩ تـا ١٨٣ ) يـا فـەره بـەرى خويندەڤان ڤىٚ ڤەكولينىٚ بخوينيت ڤەگەرٖيته دەقا چيرٖوكىٚ .

٣– مجله كتابات معاصره العدد ٢٩، سنه ١٩٩٧ ص ٢٥

٤– المكان : البنيه و الدلاله للبشير الوسلاتىٚ.

٥– المنطقة الاصليه بين المولف و الـن – طـراد الكبيـسي – مجله الاقلام العراقيه/ العدد – ٨، ١٠ – سنه ١٩٨٦ ، ىٚ٧.

٦– هەمان ژێدەر .

٧– جماليات المكـان – گاسـتون باشـلار ، ترجمـه غالـب هلسا، سنه ١٩٨٠، ص ١٩ – ٢٠ .

٨– هەمان ژێدەرىٚ چارىٚ .

٩– وجهـات ڤ النظـر– جـون برجـو – مركـز الابحـاث و الدراسات الاشتراكيه ڤَ الوطن العربيَ – سنه ١٩٩٠، ص٨٠.

١٠- حواريـات المكـان - ادوار حـال - ترجمـه گـاهر عبـد مسلم - مجله الپقافه الاجنبيه - العدد ٣ ، ٤ - سـنه ١٩٩٧ ، ص ٣٨.

١١- مروڤێ كورد و پرسا نويكرنێ - ئەمين بوتانى - گوڤارا بياڤ - ژماره ٢ هاڤينا سالا ١٩٩٩ ، ل ١١ .

# نڤیسەرا کورد و مێیاتیکرنا نڤیسینێ

* ئایا هەلبەست و ئەدەبێ ئافرەتێ،وەکو پروژەکێ هزری د بازێرڤانی و ڤەژاندنێ،د جڤاکێ کوردیدا هەیە؟ و ئەگەر هەبیت جهگیر بوویە؟و ئەگەر جهیگر ببیت،بەرەڤ کیڤە دچیت؟

ئەرێ یا پێدڤیێیە،ئەدەبێ ئافرەتێ یێ جوودا بیت ژ ئەدەبێ زەلامی؟

راستە گەلەك پویتە و خالێن هەڤپشك دناڤبەرا جیهانا ئافرەتێ و زەلامی دا هەنە، لێ ئافرەتێ جیهان و نەهێنی و پویتەیێن خو یێن تایبەت ژی هەنە،و پرس ئەوە، ئافرەت ژ کیڤە دەست پێ بکەت؟ ژ جیهانا هەڤپشك یان ژ جیهانا خو یا تایبەت؟

ئەرێ تا نها نڤیسەر و هەلبەستڤانا ئافرەت کارییە،وێ بوێری یێ ب دەتە خو و ل پرسا خو وەکو ئافرەت دەست پێ بکەت؟ کو بێ

ی بەرێ خو بدەینە ناڤێ نڤیسەرێ یا نڤیسەری،بزانین ئەڤ تێکستە کێ نڤیسی یە،ئافرەتە یا زەلامە؟نڤیسکار مێیە.. یان نێرە؟

ئەرێ بو تا نها .... وەکو دبینم ب شێوەیەکێ گشتی ل کوردستانێ ل دەڤەرا مە ب تایبەت، ئافرەت دەما دنڤیسیت ب رەنگەك گشتی هزر دکەت و چ جوداهی و نەمازەیێن خو دیار ناکەت و نڤیسینێن زەلامی نینە،ب رامانەك دی وەکو نڤیسەرەك ب مێیاتی سەرەدەری یێ دگەل پیڤەر و رویدانا ناکەت:

ئەرێ جڤاکێ رێ نەدایە وێ،کو یا بوێر بیت؟ و ئاستەنگ دانایتە درێ یا وێ دا؟ ئەگەر وەسا ژی بیت، وێ بو پرسا خو چ کریە؟ و یا پێدڤییە چ بکەت؟

ئەڤ هەمی پرسیارە و چەندین پرسیارێن دی، دهشێ من دا دلڤن،و ل دیف بەرسڤا دگەرهن،و داخوازێ ژ دەق و نڤیسینێن ئافرەتێ دکەم،ئەڤان بەرسڤا بدەنەڤە، و پرسیارێ ژ وێ و تێکستا وێ دکەم .ئەرێ ئەوا تە نڤیسی دەربرینێ ژ هزرێن تە،ئەوێن دهشێ تەدا دلڤن،دکەت؟ئەرێ ئەو ئاستەنگێن جڤاکی بو من و بو تە گەلەك پتر دانایین،نەبووینە سانسور و زێرەڤان ل هشێ مەدا؟

ئەرێ مە هەول دایە، کو ڤان سانسورا، ئەوێن گەهشتینە ئاستێ پیروزی یا ب هەلوەشینین؟ و دناخێ خودا ژڤان وەهما رزگار بین؟

ئەز دزانم کو وێران یا پێدڤییە و دیسان دزانم ئەو پیڤەرێن ئەم ل سەر هاتینە پەروەردەکرن،مەزنترین تاوانا ب ستویێ خوڤە دگرن، و دزانم بهایێ ڤێ بوێری یێ زورە... لێ چار چیە؟ تو هەر دێ ب زمانێ زەلامی پەیڤی؟ نەمازەیی و پرسا خو ژبیر کەی؟ ئەز ژی هەر

هوسا بمینم،بازرگانییێ ب دروشم و گوتنێن مەزن بکەم؟ و هەر گوتنەکێ بەرێ بێژم ب تەرازیەکا زێری بپیڤم، کا هەتا چ رادە دگەل وان پیڤەر و سانسورێن جڤاکی و رامیاری... هتد دگونجیێن! !

ئەگەر ئەم هەر هوسا،نەوێربین، و هەولا زێدەگاڤی یا لسەر وان پیڤەرێن ئاستەنگ نەکەین، تو دێ هەر مینی یا سفور ب خێلی و عەبا،و ئەز ژی دێ هەر مینم ئامرازێ سانسورێ یێ ل سەر خو و ل دویڤدا ل سەر تە.

لڤێرێ ئەز داخوازا ئافرەتەکا یاخی بوویی ناکەم،لێ یا فەرە ئافرەتا نڤیسەر، ل دویف هزرەکا مێیایەتی پرسا خو ئاراستە بکەت و ئەدەب و نڤیسینا خو دویر بێخیت ژ پیڤەرێن گشتی یان یێن زەلامی، ل دیڤ نەمازەییێن خو هزر بکەت،دا کو سەر خوبوونەکا خویی ب دەستڤە بینیت؟ و ل دویڤ پویتە و نەمازەییێن خو،ئامراز و رێکێن دەربرینێ ب کار بینیت، و ب وێ رێکێ پرا دگەل لایێ دی ((زەلامی)) دروست بکەت .

دبیت ئەڤ هەمی پرسیارە، دویر بن ژ ئەدەبی، ژلایێ هونەری ڤە، لێ دیڤ دیتنێن من ، ئەدەب وەکو کارەکێ هونەری یێ جوری، لڤینەکا زمانەڤانی، هەستێ، جوانکارییێ یە و ئەگەر ئەم بەحسی لایێ هونەری د دەقا ئافرەتێ دا نەکەین،یان تا نهو مە بەحس نەکربیت،رامانا وێ چەندێ ئەو نیە،ئەڤ لایە دێ دمێتە پشتگوھ ئێخستن ، مینا یێك ژ نڤیسەرێن مە، دەما پەرتوکەکا ڤەهێنەرەکا ئافرەت پێشکێش کری و گوتی، ئەڤە هوزان بن، یا نەو، گرنگ نینە،گرنگ ئەوە ئافرەتەکا کورد یا نڤیسی...

دڤێ بەرێخودانێدا، دیار دبێت، کا تا چ رادده، وێ دناخێ خودا چ نێرینێن نزم هەنە دەربارەی ئافرەتێ و داهێنانا وێ و ئەو نڤیسەر چ ب مەبەست یان بێ مەبەست دەربڕینێ ژ دیتنێن بەرتەسکێن گشتی دکەت.

دبیت هەر وەکو مە گوتی،ئەڤ پرسیارە دویر بن ژ پرسیارێن ئەدەبی،لێ ب ڤێ رێکێ مە دڤیا ڤێ پرسیارێ بکەین.

ئەرێ تا نهو مە ئەدەبێ ئافرەتێ وەکو نڤیسەرا مێیاتییێ هەیە، یان نەو؟

ئەرێ هەر تێکستەکا ئافرەت ب نڤیست،دکارین بێژین ئەڤە ئەدەبێ مێیاتییێ یە؟

مە گەلەك تێکستێن ئافرەتا یێن خویندین، لێ ب رێکا ناڤێ وان یێ مێ نەبا،مە نەدزانی ،ئەڤ تێکستە ئافرەتێ یا نڤیسی،چنکو وەکو هەلبژارتنا ناڤەروکێ بابەتی و چەوانیا هزرکرنێ،چ جوداهیێ دگەل تێکستێن زەلامی نەبو .

ژبلی چەند نموونێن کێم، ژ وانا هەلبەست و نڤیسینێن هەلبەستڤانا بوێر مەهاباد قەرەداغی... دەما پرسا ئافرەتا کورد و رۆژهەلاتی د نڤیسینێن خودا ددەتە خویا کرن،هەر ل رۆژا پەیدابوونا ئافرەتێ و ل ژیێ(٣-٢) سالی لیستا تشتێن شەرم و قەدەغە بو دیار دکەن و ڤەدگێڕن،و ئەڤ لیستە رۆژانە بەرەف زێدەبوونێ ڤە دچیت،تا دگەهیتە ئاستەکێ هەمی رەفتار بو ئافرەتێ قەدەغەنە،تەڤ خوشی بو وێ حەرامن، دئەنجامدا نیڤ مروڤەکا نەوێر و بێ بڕیار و هەلوێست ژێ دروست دبیت .

نڤیسینێن، مینا نڤیسینێن هێژا قەرەداغی پێدڤی ب خویندن و ڤەکولینانە، چنکو ل وی دەمێ مروڤ دکاریت ل بەرێخودانێن جڤاکی دەربارەی ئافرەتێ بگەهیت،و کا ڤان بەرێخودانا تا چ ئاست مافێن ڤێ مروڤێ پێشێل کرینە، و ئافرەت ل سەر پەراوێزێن پەراوێزا ژی نەهژمارتیە و دێ وەهاژی ب رێکا گوهداریکرنا ڤان تێکستێن ب مێیاتی هاتینە نڤیسین ل سەر ئێش و ئازار و پرسا ئافرەتێ هەلبین.

رامان سلدن Raman Selden (١) دبێژیت کو ((ئیلین شوالتر))،دکتێبا خو ((ئەدەبێ ئافرەتێ یێ پاشەروژێ)) دا،پاشمایێ ئەدەبێ ئافرەتا ئینگلیزی ل سەر سێ قوناغا دابەش کریە:

١- وەکو نڤیسەرەکا مێ Feminin ١٨٨٠-١٨٤٠ د ڤێ قوناغێدا نڤیسەرێ چاڤ ل پیڤەرێن جوانکاری یێن ((نێر))ی دکر، ئەو پیڤەرێن وی سەردەمێ زال،و دوێ قوناغێ دا پێدڤی بو ئافرەت ل وێ بازنێ دەرنەکەڤیت.

٢- ئافرەتینی Femininst یان وەکو نڤیسەرەکا ئافرەت ١٩٢٠-١٨٨٠، و دڤێ قوناغێدا، داخوازا ئێکسانیێ دگەل زەلامی و مافێ ئافرەتێ و گوهرانکارییێن جڤاکی دکرن.

٣- وەکو نڤیسەرەکا مێیاتی Female ١٩٢٠... ژ بلی داخوازیێن قوناغا دوویێ، ڤێ قوناغێ هندەك ساخلەتێن دی ژی هەنە، ژوانا رەتکرنا بەرێخودانێن ئێك لایەن و هزرێن ڤەبڕ... هزرێن نێر...و گەریان ل دویڤ ناسناما خویا نەمازەیی.

و ئەگەر ئەم بەرێ خو ب دەینە ڤان قوناغا، و بەراورد بکەین دگەل ئەدەبێ ئافرەتا کورد ،دکارین بێژین،ئەدەبێ ئافرەتێ ل جەم

مە ب شێوەیەکێ سروشتی دڤان قوناغا دا نەبووریە و قوناغێن خو یێن تایبەت ژی نیە،ژ بەر گەلەك ئەگەرا, ژوانا ئەگەرێن ناڤخویی و خویی نە، مینا فشارا جڤاکی و رەوشت و تیتالا و کێم دانا دەلیڤا فێربوونێ، دیسان هندەك ئەگەرێن دەرڤە ژی هەنە، مینا داخباری یا نڤیسەرا مە ب ئەدەبێ بیانی...

ساخلەتێن دوو ژڤان قوناغا دناڤ نڤیسینێن ئافرەتا مە دیار و خویانە ((وەکو نڤیسەرەکا مێ، و وەکو نڤیسەرەکا ئافرەت)) و دبینین ئافرەت یا بابەتێن مەزن و رویدانێن دلتەزین،دکەتە ناڤەروکێ تێکستا خو، و وەکو زەلامی سەرەدەریێ دگەل بابەتا دکەت،و دیسان دبینین ل سەر ئێکسانییێ دناڤبەرا ئافرەتێ و زەلامی دنڤیسیت و داخوازا هندەك مافێن خو دکەت، و ئەڤ هەر دوو قوناغە ب هەڤرا دژین وەکو دیاردە دخویانە،لێ حالەت ژی هەنە کو نەبووینە دیاردە مینا نڤیسینێن هێژا ((مەهاباد قەرەداغی)) کو داخوازا لابرنا بەرێخودانێن ((نێر)) ی یێن بەر تەسك، دەربارەی ئافرەتێ دکەت، و بوێر ل سەر هندەك بابەتێن قەدەغە کری ل جڤاکێ مە دا دپەیڤیت مینا (( ژنی کورد دوای ماوەیەکی زۆری هەرزەکاری و چەپاندنی وزەی زایەندی شوو دەکات و لە گەل مێردەکەیدا مومارەسەی سروشتی زایەند دەکات،کەچی لەبەر بێ ئەرك بوون لەو پرۆسە زایەندییەدا مەگەر بە رێکەوت دەنا هەرگیز ناگاتە حالەتی چێژ، کە پیاو بە گشتی لەو پرۆسەیەدا پێی دەگەن))(٢) لڤێرێ دبینین ئەڤ نڤیسەرە،نە بتنێ دڤێت دەنگێ خو بگەهینیت،بەلکو ل دویڤ بەرهەڤبوونا خو یا مروڤایەتی دتەڤایا

پروسان دا دگەڕهیت و دیار دکەت کو ئاشوپا ئافرەتێ یا زکماکی چ جوداهی نینە،دگەل ئاشوپا زەلامی،لێ پەروەردە و پیڤەرێن جڤاکی ب رێکا ((ئەڤە شەرمە بو کچێ،و ئەڤە ژی نابیت،یادی ژی حەرامە)) ئاشوپا ئافرەتێ پەککەفتی دبیت.

دەما من هەول دای،و ژبەر گەلەك ئەگەرا ڤان هزرو پرسیارا پاش گوهـ بێخم،بەرسڤ و دیتنێن خو ژی ب هێلم بو دەمەکێ دی ((هەفتیناما پەیمان)) ژمارە ٢١١ کەفتە بەر دەستێ من، و ل پەڕێ(٢) ل پاشبەندێ پەیمان ئەدەب و هونەر، هێژا (جولە حاجی) هەلبەستەك ل ژێر ناڤێ (نفستنەکا بێدەنگ) بەلاڤ کربو ، ڤێ هەلبەستێ فشارەکا دەروونی ل سەر هشێ من کر،و ئەڤ پرسیارە دناخێ من دا ئازراندنەڤە، چنکو من، ئەڤ هەلبەستە دیت،ب زمانەکێ مێ بو مێ و (نێر) ی هاتیە نڤیسین، و دڤێ هەلبەستێدا هێژا ((جولە))تا رادەیەکێ دبازنێ نڤیسینێن ئافرەتێن بەری خو،دەردکەڤیت،هەول نەدایە وەکو وان ... خو ب دەتە نیاسین ((قەهرەمان و شورشگێڕ،داخوازێ ژ زاروکێ خو بکەت، چەکی هەلگریت و پشکدارییێ دشورەشێ دا بکەت،و دەما بابێ وی شەهید دبیت،جهێ بابێ خو بگریت،و رێبازا وی نەهێلیت و درێژاهییێ پێ بدەت))ب رامانەك دی یا هەول دای بەرخودان دناڤ هوزانا وێ دا هەبیت،بەلێ بەرخودانەکا دویر ژ دروشما و دویر ژ پیڤەرێن بەرخودانێ یێن ئەدەبێ زەلامی،هێژا ((جولە)) یا هەول دای وەکو ئافرەتەکا سروشتی ((یا مێ)) سەرەدەری یێ دگەل بابەت و رویدانێ بکەت، دکارین بێژین بەرخودانا وێ،بەرخودانا مێیاتییێ یە

،و كار دكەن ژبو پشكداريكرنا ئافرەتىٚ دپروسا دروستكرنا برِيارا جڤاكيدا، ب رێكا بەرێخودانەكا رەخنەيى و لێدانا (ديتنێن نێر) يێن دەستهەلاتدار، ديسان يا هەولداى ژ شێوەيێن راستەوخو و راپورتى دەربكەڤيت و بەرەڤ پەيداكرنا ڤالاتى و مژداريىٚ دناڤ تێكستێدا بچيت، لەوما ژى وەرگر دڤىٚ هوزانێدا دكاريت پتر ژ ديتنەكىٚ تێدا ببينيت.

مە گوت بەرخودان دڤىٚ هوزانێدا ((نڤستنەكا بێدەنگ)) بەرخودانا مێياتيىٚ يە، و لێدانا ديتنێن ((نێر))ن... و ئەڤ چەندە خويا دبيت دەما تێت و هەمى ((نێرا)) ب تاوانبار دبينيت چ نڤشىٚ نوى ((سەيىٚ مو رەش)) يان نڤشىٚ كەڤن ((سەيىٚ سپى)) دەما دبێژيت :

بێژە من ...
كىٚ تاوانبار بكەم
سەيىٚ مو رەش
و خوە خاپاندى
يان سەيىٚ سپى و دل پەككەفتى؟
ديسان دەما دبێژيت :
كەڤرێن بىٚ مەژى نەرم نابنەڤە ...

لڤێرىٚ پروژىٚ نڤيسينىٚ ل جەم ڤىٚ نڤيسەرىٚ،پروژەكىٚ پاشەرۆژێيە،چنكو رەخنە ل ئاڤاهيىٚ رەوشەنبيرى يىٚ جڤاكى كريە... و يا ڤياى تەڤايا سيستەمێن ئەڤ ئاڤاهييە پىٚ هاتيە ئاڤاكرن، بێختە دبازنىٚ گومانێدا، و ب هەلوەشينيت تا دگەهيتە وىٚ

پرسیارا ئەزەلی ((ئەرێ دژیانا پشتی مرنێ ژی دا،دێ ئافرەتا مە،مینیت یا چەوساندی... دەما دبێژیت:

نوزانم لاپەڕا دی

چ هەمبێز کریە !

چونکو هەرگیز

تو چووی ونازڤڕیەڤە ! !

لڤێرێ هەلبەستڤان ((جولە حاجی)) دڤێت هەبوون و نەبوونا خو وەکو ((مێ)) بکەتە پرسیارەك دقەیرانێدا، و هەمی پرسیارێن خو بە بەرسڤ هێلاینە، و ب رێکا نەمازەیێن خو پێنگاڤا دهاڤێت بەرەڤ جیهانا گشتی، بەروڤاژی ژ یێن بەری خو، ئەوێن دەقێن وان،ڤالا ژ کەساتی یا وان یا ((مێ)).

ئەڤ هەولا دەرکەفتنێ ژ پیڤەرو دیتنێن نێر یێن زال و دەستهەلاتدار،دناخێ خودا دەرکەفتنە ژ دیروکا بێ هەژاندن و لڤین،دەرکەفتنە ژ دیروکا دووبارە و گەهی، بەرەڤ هەژاندنەکێ کو ب گیان و ناخێ جڤاکی ب کەڤیت.

ب ڤی رەنگی ژ ئەدەبێ ئافرەتێ دکاریت ب رێکا مێیاتیکرنا خوە، مە پالدەت داکو پێداچوونێ ل سەر هزرێن خوییێن نێر بکەین، و بزانین تا چ راددە ئەم گونەهبارین، و بڕیارێن مە یێن نێر چەند دویرن ژ دلوڤانییێ.

و ژلایێ هونەری و تەکنیکێ ڤە ژی نڤیسەرێ هەولا دروستکرنا رستەیێن هوزانێ دایە ب رێکا پەیڤ و زمانی ڤە یا شیای ژ رویدانا خو رزگار بکەت،رویدانا بکەتە هێما و جەڤەنگ، یان یا شیای

زێدەگاڤیێ ل سەر رویدانێ بکەت هندەك لایەنێن دی،دویێ ئەزموونێدا بەر چاڤ بکەت.

پشتی من ئەڤ دەقە خویندی، وەسا بو من خویا بو، کو ئێدی ئەم نکارین ئافرەتێ بهێلین بەندەوارا هزر و بیر و بوچوونێن خو یێن نێر... و پرسا ئافرەتێ دێ پتر بیتە پرسەك دقەیرانێ دا...

هیڤیا بەردەوامییێ بو ڤێ هەلبەستڤانێ دخوازم ... دیسان هیڤیدارین ئەو و یێن مینا وێ، پتر پێنگاڤێن بوێر ب هاڤێن و کەساتی یا خو یا نەمازەیی بکەتە سەنتەرێ ڤەکێش و دیتنێن خو

١- الثقافة الاجنبية (مجلة ثقافية عراقية فصلية) العدد ١ سنه ١٩٩٢ محور العدد – دراسات في الاب النسوي – النقد النسوي- رامان سلدان – ترجمه سعيد الغانمي ص٤٨.

٢- وێران – گوڤاری وێرانی داهێنان – هەولێر- ژمارە (١) سال ١٩٩٤ مەهاباد قەرەداغی – زایەندی تابووکراو لە کۆمەڵگای کوردەواریدا – ل٦٧ – ٦٩ .

# هەلوەشاندنا تێکستییێ و پلۆرالیزمی یا ڤەخوندنیێ

تا نیڤا دوویێ ژسەدسالیا بووری ، وەها هزر دهاتە کرن کو چ کێشە نینن ب ناڤێ کێشەیا وەرگری، هەمی تیورێن رەخنەیی وەها رێککەفتبوون کو پرۆسەسا خوندنێ ، پروسەیەکە ب هێسانی دهێتە کرن ، و ژبۆی ئەنجامدانا ڤێ پرۆسەسێ ب تنێ خویندەڤانەك و تێکستەك دڤێت ، چونکە ل پەی ڤان هزران پەیوەندییەکا راستەوخو هەیە دنێڤەرا تێکستێ و خویندەڤانی دا, یان هێلەکا راستەراست دنێڤبەرێ دا دروست دبیت .

لێ هژمارەکا پرسان ل دور ڤێ پەیوەندیێ هاتنە ئاراندن .ل دور ڤێ چەندێ نڤیسکار نادر کاظم دپرسیت ( ١ ) : ( ئەرێ ما نەبوویە کو بیناهی یا خویندەڤان ژ تێکستێ ڤارێ ببیت داکو بەر ب تێکستەکا دن ، نەك ئەوا دهێتە ڤەخویندن بچیت ؟) پرسەکە و

پێدڤی یە ل سەر راوەستین ، و دبێژین.. خویندن و وەرگرتن پروسێسەکا هێسان نیە ، بەلکو پرۆسەسەکا سەخت وئالوز و تێکرِەسە ، دگەل کۆمەك مەرج و هەڤبەندیێن دەرڤە ، یان کو خویندن ، دانەر ، باگراوەندیێ چاندی و هزری و جڤاکی .. هتد ، باندورا خویا ئێکسەر ل سەر پروسەسا وەرگرتنێ هەیە ، یان ب رامانەك دن هێلەکا راستەراست دروست نابیت دنێڤبەرا بنیاتێ تێکستێ و هوشگەها خوێندەڤانی ، کو هژمارەکا ئالاڤێن کارتێکەر هەنە ، وەسا فشارێ دکەن ل سەر پرۆسەسا وەرگرتنێ.. کو چ هێلێن راستەراست دروست نەبن ، بەلکو ئەو هێل دەمان جار ڤارێ ببیت ، یان هێلەکا زاکزاکی وقەتقەتکری بهێتە دروستکرن .

هەروەکو مەدایە خویاکرن ، کو تا نیڤا دوویێ ژسەدسالی یا بووری ، هزر وەها دهاتەکرن کو چ کێشەك نینە ب ناڤێ کێشەیا وەرگری ، وهەمی تیورێن رەخنەیی ژی ل سەر هێسانی یا پروسا خویندن و وەرگرتنێ رێککەفتی بوون .

وەلێ ل داوی یاسالا ١٩٦٧ و پشتی هژمارەکا تیورڤانێن ئەلمانی ل سەر ڤێ مژارێ راوەستیاین و چەندین دید و چەمك و تێگەهێن جودا جهگیر کرین ، ئەڤ مژارە ژئالییێ تیوری ڤە پتر هاتە ئاراندن ، ئەمازە پشتی ندیسکار ڤولنڤانگ ئیزر ، گوتارا خوە دیروکا ئەدبی ل سالا ١٩٦٧ بەلاڤکری ، ول دویڤ دا گوتارەك دن ل سالا ١٩٦٩ ل ژێر ناڤێ ( گوهرین دنموونەیا چاندا ئەدبی دا ) بەلاڤکری .. لەو هەر ژوان سالان و تا نهو گرنگییەك مەزن ب مژارا وەرگرتنێ دهێتەدان ، ونها چەندین گوڤارێن تایبەت هەنە ، دڤێ بوارێ دا چەندین

خویندنگەهێن بسپۆر هاتینە ئافراندن ، ژوان " خویندنگەها کونستانس Konstanz schule ، نڤیسکارێ عەرەب ( عمارە کحلی ) خویندنگەها هان ب ڤێ ئاوایێ ددەتە نیاسین و دبێژیت : ( ئەڤ خویندنگەها چالاك دنێڤ زانکویا کونستانت دروست بو ، و ل دویڤدا ئەڤ خویندنگەهە شیا سنوورێن زانکویێ ب بەزینیت . سەرکێشێن ڤێ خویندنگەهێ هەول ددان کو تیورا وەرگرتنێ بدەنە نیاسین و دید ونێرینێن خوەیێن رەخنەیی ل گور خویندنا تێکستا ئەدەبی ودیروکا ئەدەبی خویا بکەن ) ( ٢ ) ونەڤ تیورڤانە شیان کارتێکرنێ بکەنە سەر دید و نێرنێن زال و ژ ئەنجامێ کارێ وان ، کونگرێ نەهێ یێ کومەلا ئەدەبێ بەراوردکرییێ جیهانێ ل سالا ١٩٧٩ کارناما خو تەرخانکر ل دوّر ( گەهاندنا ئەدەبی و مژارا وەرگرتنێ ) . ( ٣ )

تیورا وەرگرتنێ چەندین دید و نێرینێن جودا جودا ل دوّر وێ هەنە ، لێ هەمی دکۆکن ل سەر گەهاندنێ ب ئاوایەکێ کو شێوازێ وەرگرتنێ دنێڤبەرا تێکستێ و وەرگری هەرگاڤ نوی گەهـ بیتەڤە ، هەرگاڤ دنێڤبەرا هەردوو ئالیان دا ، دایەلوك وکاریگەی هەبیت ، ئەوژی ب ساخ ونویژەنکرنا پرسیاران ، ب رێکا پروسا راڤەکرن و شروڤەکرنا تێکستێ ژ ئالیێ هوشگەها وەرگری ڤە . و ئەڤ پرۆسەسە ژی یا هەڤبەندە ب دوو ئاستەنڤە:

١- بەرهەڤبوونا تێکستێ بۆ کریارا راڤەکرن و هەلوەشاندنێ ، ئەوژی دەما دانەر ، پەیامهنێر ، بیاڤەکێ د تێکستا خوەدا بو وەرگری تەرخان بکەت ، داکو هوشگەها دانەری هەماهەنگ بیت.

٢ – بەرهەڤبوونا وەرگری وئاستێ وی یێ هزری و مەعریفی و رەخنەیی ، کا هەتا چ رادە دکاریت د راستەرێیەکێ دا تەڤلیبوونەکێ دبیاڤێن تێکستێ دا ژ خورا دابین بکەت .. و ئەگەر پتر ل سەر ڤێ خالێ راوەستین دبێژین ، پروژێ ستاتیکی یا وەرگرتنێ رەواتی یا خو ژێ وەردگریت ، وەرگر وەکو بەرجەستەکارێ کریارا تێکستێ .. لەوا دبینین مشە بوچوون و نێرین هەنە ل دوڕ هەڤبەندیا وەرگری دگەل دانەری و تێکستا وی .. رولان بارت داخواز دکەت کو گەرەکە مرنا دانەری ب هێتە راگەهاندن ، و ب داخوازی ،دڤێت ئاوایێ هەڤبەندی یێ دنێڤبەرا ( دانەری و تێکستێ و وەرگری ) سەروبن ب هێت گوهارتن داکو خوێندەڤان/ وەرگر و دانەری ڤە گرێدایی نەبیت .. و سەرەدەری یا وی دگەل تێکستێ سەرەدەریەك ئازاد و دلسوز بیت ، ئەوژی ب لادان و ئاشکراکرنا مرنا دانەری .. ل وی دەمی دێ بیتە گەروکەکێ ئازاد دناڤ جیهانا تێکستێ دا ، و ل پەی ڤێ باوەرێ خوێندەڤان دێ رێیا خوە بو دلێ تێکستێ و چێژ و خوشیا وێ ڤەببینیت . لێ راگەهاندنا مرنا دانەری کارەکێ سەخت و ئالوزە ، نەمازە ل جەم مە ، چونکە ئەم وەها راهاتینە کو مە هەڤبەندیەك دوّمدار دگەل دانەری و رێبازا وی یا هزری هەبیت ، ڤێجا هەڤبەندیا هان چ یا نێگەتیڤ بیت یان یا پوزەتیڤ بیت ، لەوما ژی مە هەر دەم هەلوێست هەبوویە ل هەمبەر دانەری ، و زوّر جاران دبێژین ئەڤ دانەرە یی چالاك و هەژی و ڤەکریە ،یان یێ پاشڤەمایی و گرتی یە ، ئەڤ گوتنە ب چەندین شێوەیا تێتە دووبارەکرن ، و ئەڤ گوتنە حوکمن و رەنگڤەدانا خو راستەراست لسەر تێکستێ ژی بەرجەست

دبیت . یان کو و ل پەی ناڤیێ دانەری مە دید و نێرینێن خوییێن پێش وەخت ل سەر تێکستیێ هەنە .. وباندورا خو دکەتە سەر پەیوەندیا وەرگریێ دگەل تێکستیێ ، یان کو پروسا وەرگرتنیێ درێکا دانەری دا دبووریت ، و ئەڤ چەندە ژی ناهێلیت وەرگر خویندنەکا راستەقینە بو تێکستیێ بکەت ..و مروڤ نەشێت خو ژڤیێ بازنیێ رزگار بکەت و ئەڤەژی کێماسیەکە پروسا وەرگرتنیێ ئیفلیج دکەت .. و ل دویڤ پیڤەرێن ئەم ل سەر هاتینە راهاتن و پەروەردەکرن ، ئەم نەشیاینە قوربانییێ ب هەمی بنەما و ستراکتور و باگراوەندێن خوییێن هزری و مەعریفی و جڤاکی بدەین .. لەوما ئەڤ داخوازەکا رادیکالە, وەلیێ ئەڤ راگەهاندنە .. راگەهاندنا مرنا دانەری پرسەکا هێسان نیە هەر وەکو مە گوتی کارەکیێ چاندی و هزری دڤێت هەتا ب هێتە ب جهکرن .. لەوما دیێ کارین بێژین کو چ خویندن نینە ژ نمرا سفریێ دەست پیێ بکەت ، وهەروەها چ نڤیسین ژی نینە ژ هەمان پلەییێ دەست پیێ بکەن .. و هەتا عەقلیێ روژئاڤا ژی نەشیا ( ژ کێمی ڤە نەشیا تا دەسپێکا سەد سالی یا بووری) خوە ژ دید و نێرینێن زال رزکار بکەت ، بو نموونە روژهەلاتناسا ب عەقلەك روژئاڤایی تێکستا روژهەلاتی دخویندن .. هەروەها وەکو نموونە ئەم روژانە ب دەهان ریکلاما دبینین و هەر ریکلامەك وەکو دزانن ، پەیاماکە ژ ئالییێ پەیامهنێری ڤە دهێتە ئاراستەکرن ، کو ب ڤان ریکلاما شەهرەزاییێ ریکلاما هەول ددەت سەمتا هزرا مە بگهوریت بەر ب رەوشا بەرکاریێ ریکلامیێ ، لیێ ژبەر کو مە باگراوەندەك تایبەت هەیە ل دور بەرکارێن دی ،لەوما ئەو هێلا راستە و راست یا وی دڤیای دنێڤبەرا ریکلاما خو

و هوّشگەها مەدا دروست بکەت، ڤارێ دبیت و ب دەهان فاکتەر باندورا خو دکەنە سەر وێ هێلێ ، هەلبەت ژ ئالییێ هزری ژی ڤە هەمان شێواز و سەردەری دگەل پەیام و پروسێن دن ژی بەرجەستە دبیت ، لەوما دێ کارین بێژین ، هەرچەوا بیت دڤێ گاڤێ دا ( گاڤا خویندنێ ) هەڤبەندیەك دنێڤبەرا ڤێ سێ گوشەیێ دمینیت ( دانەر ، تێکست ، وەرگر ) و ل جهێ راگەهاندنا مرنا دانەری ئەوا رولان بارت داخواز دکەت ، تیورڤان ( جورج بولی ) ( ٤ ) داخوازەك دن پێشنیار دکەت ، ئەوژی " ئاشتبوونەڤە دگەل دانەری " دروستکرنا پەیوەندیەکا ئێکسان و وەکهەڤە ، ل ڤێرێ ( بولی ) وەها ددەت خویاکرن کو راستە وەرگرییێ ڤەگریدایە ب هژمارەك هەڤەبەندیێن چاندی وئەدەبی و سوسیولوژی و دەزگەهی یێن ئالوز ڤە .. لەوا نەشێت خویندنێ ژ نمرا سفرێ دەست پێ بکەت ، لێ دکاریت ب ئاوایەکێ ڤەکری و دیموکراسی تێکستێ ب خوینیت و رێزێ ل ئەوێ دی یێ جیاواز بگریت و سەرەدەریەکا عەقلانی دگەل دانەری و تێکستا وی بکەت . هەروەها نڤیسکار بخوژی دگەل وەرگری ، پەیوەندیەکا یێکسان دروست بکەت..داکو ئەڤ هەڤبەندییە رێچکەکا سروشتی و دیموکراسی وەربگریت و ل ڤێرێ دێ کارین بێژین کو پێشنیارا "جورج بولی" داخوازەکە ژبوی دیموکراسیکرنا پروسا خویندن و وەرگرتن و نڤیسینێ ، و ل سەر ڤێ بنەمایێ فرەهـ هزری وفرەهـ دەنگی و دیاردێن بەربەلاڤ و تیدا بیاڤێن تێکهەلبوون و رەواتی یا هەوبوونا جیاوازی یا دابین دبن . و ئەو پەیوەندیا دنێڤبەرا نڤێسکاری و وەرگری دا ، نابیتە پەیوەنیەکا یێکسان هەتا نەگەهتە

وێ راستیێ كو سەردەمێ یێك دەنگیێ نەمایە ، وفەرە وەرگری ژی ئەو دەلیڤە بو هەبیت داكو كارێ خو دناڤ تێكستێ دا بكەت ، كارەكێ ئازاد و رەخنەیی .. بێ ی كو تێكستێ سەنتەرەكێ دائخستی و یێكانە هەبیت .. یێك سەنتەری یێك خویندن ژێرا دهێتەكرن و وەرگری لاددەت ، لەوما ژی بەرهەڤبوونا خویا پوزەتیڤ بەرجەستە ناكەت .. وەرگر داكو هەستێ ب هەبوونا خو بكەت ، پێدڤی یە تێكست یا بەرهەڤ بیت ، چەندین پرس و ڤالاتی تێدا هەبن .. وەرگر كارێ وی ئەو بیت ژ بەرسڤا بگەڕهیت و وان ڤالاتیا پر بكەتەڤە و تشتێ نەدیار دیار بكەت ب كورتی ئەو دەلیڤە هەبیت بو وەرگری كو ببیتە خودانێ تێكستێ ب هەمی رامانێن خوڤە .. دێ تێگەهشتنا خو هەبیت داكو ب رێكا وێ شروڤەكرن و راڤەكرنێ ئاڤاهیەك دن ئاڤا بكەت ودبیت ئەو ئاڤاهیێ جودا بیت ژ تێكستا یێكێ .. یان كو پروسا خویندنێ ژ سەمتەكا جیاواز ب داوی بینیت ، ل دویڤ باوەرا من ب ڤی رەنگی ب دیموكراسیكرنا گوتارێ دێ خویندن بیتە پروسەكا بەردوام و ئەو تێكست زیندینە ئەوێن خویندنێن جیاواز هەمبێز دكەن ، لێ بەرامبەر هندەك دیدێن دی ژی هەنە ، كو دبێژن چ تێكستێن داێخستی نینە ، یان ب گوتنەك دن ، تێكست دهێتە داێخستن ب كریارا خویندنێ .. بو نموونە دبیت نڤیسكارێ كتێبا چیڤانوكا هزار و ئێك شەڤ ( الف لیله و لیله )وەها هزر نەكربیت كو ب دەهان خویندن ژێرا دێ هێنە كرن ، لێ كریارا خویندنێ وپڕكرنەڤا ڤالاتییێن تێدا هەین .. ئەڤ چیروكێن چیڤانوكی كرنە هێڤێن بو دەهان تێكستێن دی .. ل ڤێرێ كریارا خویندنێ

پروسا داهێنانێ بەرجەستە دکەت. یێك ژ ڤەکولەرا وەها تەماشەی ڤێ تێکستێ کر کو پەیوەندیا دنێڤبەرا شەهریارێ /فەرماندار و شەهرەزادا / فەرمانلێکری وەکی پەیوەندیا دنێڤبەرا دەستهەلاتێ و رەوشەنبیری یە د وەلاتێن دکتاتوری دا ، کو هەردەم پێدڤی یە ل سەر رەوشەنبیری مینا شەهرەزادا فەرمانلێکری ب ئاخڤیت و ب بیتە ئامرازەکێ بووقدارییێ و راچاندنا پەیڤ و هەلبەستا بو بەژن و بالایێ میرێ دەستهەلاتدار .

ل ڤێرێ دێ زڤرینە پروسا وەرگرتنێ ، کو دڤێ خویندنێ دا ، وەرگری تەڤلیبوونەك تێدا خویاکر ، دیسان چێژ و خوشیەك ژ تێکستێ وەرگرت لەوا ناڤەروکا تێکستێ دهناڤێت وێدا پەقینەك بەرپاکر ، داکو تێکستێن نوی بکەڤنە قادا پەیدابوونێ .. هەروەکو ( ئەمبێرتو ئیکو ) دایە خویاکرن ( "تێکست ئامیرەکێ خەمسار و تەمبەلە و یێ ژ کارکەفتی یە ، هەتا کو خویندەڤانەك ب سەر هەل نەبیت و نەبزڤینیت نزانیت چەوا دێ هەماهەنگی و پالپشتیەکێ دگەل ئاڤاکەت ... " ) ( ٥ ) .

دیسان جاك درێدا د گوتنا خوه یا ناڤدار دا ( کو چ تشتەك ژ دەرڤەی تێکستێ نینە ) گوتنا هان ئەوا کو ل سلال هاتیە خویاکرن پەسند دکەت (( چ تشتەك ژ دەرڤەی تێکستێ نینە )) و پێش ڤێ گوتنێ دوبارە دکەت و د بێژیت : ( چ تشتەك دەرڤەی تێکستێ نینە ، هەروەها چ تشتەك د نێڤ تێکستێ دا نینە ، ب تنێ ئەو شوینەوار نەبن یێن کو خویندەڤان ب سەر هەلدبیت ) و ئەڤەژی د رەخنا رەوشەنبیرادا یا پشتی بونیادگەریێ مینا پروتوکولەکێ یە : ئەڤجا

تێکست ب خویندەڤانی هەبوونا خو بەرجەستە دکەت ئەو ژی ب رێکا راڤەکرنا خویندەڤانا بو رەهەندێن تێکستێ و ئاڤاکرنا دایەلوکەکا زیندی دگەل سەردەمێ تێکستێ ، و ئەڤە داخازا رەخنەگرێ ئەلمانێ ( هانس روبرت یاوس ) بو ، کو ئەوژی بێك بو ژ سەرکێشێن خویندنگەها کونستانس یاکو هەر ل دەستپێکا ڤێ نڤیسینێ مە ئاماژە پێ کرێ ، کو داخوازا جورەکێ هەڤگرتنا ئاسویا دکر ژ بو بێککگرتنا سەردەمێ بووری و ئەڤروییێ تێکستێ . هەروەها یاوس دبینیت ، کو چ بکارێن ئەدەبی نامینن نەلڤ . بەلکو تێکستێن هان ل پەی گوهرینێن پروسە و ئاستێن وەرگرتنێ دمێتە گوهرین کو ئەو بو سێ گاڤێن ژهەڤ نێز پارڤە دکەت :

١ – گاڤا وەرگرتنا تام و چێژێ ، و دڤێ گاڤێ دا ، خویندەڤان هەستێ ب رەوشا ستاتیکی یا دەقی دکەت .

٢ – گاڤا راڤەکرنا باگراوەندێ : کو تێدا وەرگر دێ ژ ستراکتورێ تێکستێ دەست پێ کەت د رامانا پێدزێ بەرجەستەکەت .

٣ – گاڤا هەڤگەهشتن یان خویندنا دیروکا یاکو رەهەندێن تێکستێ ل جەم وەرگری جارەکا دی ئاڤا دکەت ب ئاوایەکێ وەها کو تێکستا هان مینا بەرسڤەکێ بیت بو پرسەکا کو ل سەر دەمێ ئاڤاکرنا هان دا هاتبیتە ئاراندن .

دبینم ئەم ل سەردەمەکێ دا دژین ، کو سەردەمێ پرسانە ، لەوما گاڤا چارێ دبیتە گاڤا ئاراندنا پرسان ، کو تێکست مینا ژێدەرکێ ژین نەهاتی ، هەروهەر پرسان دروست بکەت ، و دێ ستاتیکا وەرگرتنێ ژ رامانێ بەرەڤ رەنگڤەدانا رامانێ چیت .. و وەرگر دێ

دگەل تێکستێ ژیت .. یان ب رامانەك دی تێکست نامینت ب تنێ بو شروڤەکرن و رێ نیشاندانێ ، بەلکو بو ڤەژاندنێ یە .. دیسان یێکدەنگی و زالبوونا یێك هزر و لوژیکا رەهایی دێ دناڤ تێکستێ دا بەر ب ووندابوونێ چن .. چونکە ئەڤ گاڤا ، گاڤا رزگاربوونا تاکە کەسی یە ، رزگاربوونا وەرگری ژ دەستهەلاتا دانەری و تێکستێ ، بەلکو نە ب تنێ دێ خو ل ژێر فشارا تێکستا رزگار کەت ، بەلکو بەروڤاژی ژ جاران دێ وەرگر دەستهەلاتا خو ل سەر تێکستێ پراکتیزە کەت ، یانکو وەرگر هەر چاڤەرێیێ بەرسڤا نابیت ، بەلکو وەرگر / خویندەڤان دێ پرسان ئارینیت و دێ دایەلوکێ دگەل کەت و دێ تێکستێ ب زمان ئینیت ، لەوما دێ خویندەڤان نڤیسینێن کونکریتی رەت کەتەڤە ، یان ئەو نڤیسینا مەرجێن پێدڤی تێدا نەبن و ژوانا ژی هەبوونا ڤالاتییێ ، ب ئەگەر پوشیایی دنیڤ ڤێ نڤیسینێ یام یادی نەبیت دێ ب نڤیسینەك لاواز و نەبەرهەموار هێت ل قەلەم دان ، دێ داخوازا تێکستەکا بێ لایەن کەت ، چونکە هەتا بکاریت خویندنەکا ئازاد د تێکستێ دا بکەت وی پێدڤی ب تێکستەکا ئازاد هەیە و ل ڤێرێ جارەك دن دێ ڤەگەرێینە سەر وێ گوتنا ناڤدار ( مرنا دانەری ) ئەوا کو ژلایێ رولان بارتی هاتیە راگەهاندن ئەڤە ژ لوژیکا سەنتەرلیزما ئایدیولوژی ددەت ، ئەو گوتارا خوەدی سیمایەکێ توتال و هەمیشە داخوازا پاوانکرنا راستییێ دکەت ئەڤ گوتنە پێشنیارە ژبوی خو رزگارکرنێ ژ دانەری ئەوێ گەلەك جاران گەهشتییە پلا پیروزێ یێ ل جەم مە ، وتا نهو گوتارا مە ل ژێر ڤێ فشارێ دنالیت ، هەر یێك ژ مە بۆ خوە خوداڤەندەك دروست کریە و

وەها هزر دکەین کو هەمی راستی ل جەم کەسینییا وی دزڤڕن — کەسینییا وی هەلگرا راستییا رەهایی یە ، لەوما ژی دکارم بێژم کو ئەم جڤاکەکێ تێکستکینە ، هزرا سەلەفی ل سەرمە زالە ، یان ئەم تێکستا ب شێوەیەکێ ڤەگوهاستی ( نەقلی ) وەردگرین .. کو ئەڤ وەرگرتنە ناگەهتە ئاستێ راڤەکرن و شیکاریێ یان ب گوتنەك دی ، تێکستێن دمینیت یا دەستهەلاتدار و مێشکێ مە داگیر دکەت .. لەوما ژی پەیوەندیا مە دگەل تێکستێ پەیوەندیەکا هێسان نینە . و ئەم ل دەرڤەی تێکستێ دزڤڕین ، یان مە هەول نەدایە کو تیڤلا دەرڤەیا تێکستێ ب سمێن و بەر ب هەلوەشاندنا وێ لوژیکێ بچین ئەوا تێکست ل سەرهاتیە ئاڤاکرن ، و لەوما ژی هزرا سەلەفی وەها هزر دکەت کو ئەڤ سمتنە مەحالە بهێتە ئەنجامدان ، و ل پەی وێ هزرێ رەواتی بو چ جورێن جیاوازیێ و پلورالیزما چاندی و هزری نینە ، ب رامانەك دی هزرا ئازادییا راڤەکرنێ رەت دکەتەڤە ، و گوتارەك رەها و توتالە وناستەنگە نە بتنێ بەرامبەر پروسا داهێنان و ئافراندن و دەستڤەئینانا بەرهەمێن مەعریفی ، بەلکو ئەڤ گوتارە هەمی مەرجێن بەرپابوونا شەڕو قەیرانێن نێڤخویی ژی بەرجەستە دکەت . ئەگەر ئەم پێداچوونەکێ ل سەر گوتارا خو یا چاندی بکەین ، ئەگەر پێداچوونەکا رەخنەیی ل سەر زمانێ میدیاییێن مە بکەین ، دێ بینین زمان وگوتارا مە هەڤبەندن ب نێرینەکا ئایدیولوژی و رەهاڤە ، پشکەکن ژ تورا دەستهەلات و هێزێ لەوما ژی رستێن مە پڕن ژ فەرمان و رەتکرنێ, گوتارا مە وەها خو ل قەلەم ددەت کو یا دویرە ژ گومانێ ، کو یا دەربڕینێ ژ هەمی جڤاکی دکەت ، لەوما ژی

خو دبينيت كو يا بەرەڤانييێ ژ بەرژەوەندييێن بلند دكەت و ب كارئينانا ڤان پەيڤان ( بێ گومان ، پێدڤی يە ، حەقيقەت ، نابيت ، تڤيا .. هتد ) ل دەسپێكا رستێن مەدا دياردەكا بەربەلاڤە .

هەتا روژنامەڤانێ مە .. يان بێژەرێ مە .. هەول ددەت كو ديدا خوە ل سەر عەقلێ خويندەڤانی زال بكەت ، ئەگەر ئەم تەماشەی چەوانيا دارێژتنا پەياما د روژناماڤانيا مەدا بكەين ، دێ بينين كو چ دەليڤا بو وەرگری ناهيليت ، داكو هزرا خوە د پەيامێ دا بكەت ، بەلكو بەری پەيامێ خوە ب هنێريت ، هەلويستێ ، خوە ديار دكەت و حوكمی ددەت و پەيامێ شروڤە دكەت و ب هەمی شێوەيا هەول ددەت كو وەرگری / خويندەڤانی ب هەمان هەلويستێ خوە قايل بكەت . ب گوتنەك دی ناهێليت وەرگر ب ئازادی تێكهەلی دلێ تێكستێ ب بيت و وەرگر عەقلێ خو بكەتە پيڤەر و ل سەر وێ چەندێ ب ئازادی هەلويستێ خوە وەربگريت ، ل ڤێرێ پەيامهنێری باوەری ب پلوراليزما هزری و چاندی و جڤاكی نينە ، ئەگەر ئەو باوەری هەبيت ، باوەری هەبيت كو رەوايە ئەز هەلويستەكێ سەربەخوە و جياواز وەربگرم ، دێ ب تنێ پەيامێ خوە ئاراستەكەت ، دێ ل وەرگری گەرهيت كو ئەو بكارێ راڤەكرن و وەرگرتنا هەلويستێ رابيت ، و ب هەمان ديد ، دكارين بێژين كو دبوارێن دی ژی دا ئەم روی ب روی ڤان رەنگە گوتار و تێكستان دبين ، چونكە هزرا توتال و دائێخستی ل جەم مە زالە ، ئەڤ هزرە ژی چ دەليڤێ بو ئەوێ دی ناهێليت .. چونكە باوەری ب جياوازيێ نينە ، تێكستەكا رەهايە ، پرسان رەت دكەتەڤە ..كەس دكومێ دا

بژیت و رەئییێ یاخی نەبیت و هەر و هەر ب بڕیارا گشتییێ زال قایل ببیت .. لەوما مە پویتە ب رولێ وەرگری نەدایە و وەرگرێ مە ژی هەر داخوازا گوتارێن راستەوخۆ و راپورتی دکەت . لەوما ژی کارکرن ژبو ئازادکرنا عەقلی ، یا بوویە پێدڤییەکا سەردەمی داکو مرۆڤ بکاریت سەرەدەریەکا زانستی و دیموکراسی دگەل ئەوێ دی بکەت ، و بنەمایێن پێکڤەژیانا پلورالیزمی دجڤاکی دا بەرجەستە بکەت .

دبینم کو بێك ژ مافێن هەرە رەوا بێن هەر وەلاتیەکی ئەوە کو ل سەر هەمی تێکستا راوەستیت و بنەما و ستراکتورێن وان ب هەلوەشینیت و پرسان بکەت و هەر تێکستەکا دگەهتێ د عەقلێ خودا شیبکەتەڤە یان عەقلێ خو بکەتە دادوەر و ئەگەر عەقلێ وی ئەو تێکست قەبیل نەکر رەت بکەتەڤە ، هەر وەکو رەوەندێ بەری سەدان سالان گوتی " هەمیێ تێکستا دێ د عەقلێ خودا شروڤەکەم ، ئەگەر پێ قایل بووم دێ هەمبێز کەم ، ئەگەر نەو من چ پێدڤی پێ نینە " .

ژێدەرێن مفا ژێ هاتیە وەرگرتن :

١ – نادر كاظم / متوسطات القراءة ام عزلة النصوص . WWW. zamah com

٢ – محمد عبدالواسع WWW . alb yan . com

٣ –د . بشرىَ موسىَ / نظرية التلقيَ / اصول و تطبيقات : ......

٤ – ئێدەریَ ئیکیَ .

٥ – نادر كاظم / ما هو النص WWW zamal . com

ئەڤ بابەتە ل گوڤارا بیاڤ هاتیە بەلاڤكرن ل زڤستانا ٢٠٠٣ ژمارە ١٢

# زمان و توندكارى

ژ لڤين وبزافتنێن دەستان و دەرئينانا دەنگان بەر ب ئاخفتن و لدويڤدا پێكئينانا زمانى ،پرۆسەسا هەڤگەهشتنا هەڤدوو وەرار ب خوڤە ديت ، كو ئاخفتن و زمان مەزنترين دەستكەفتن, عەقلێ مروڤاتيێ بدەستڤە ئيناى و مروڤ ژ گيانەوەرێن دى جودا كرى ، و گشت دەستكەفتێن دى ئەوێن بووينە بەرهەمێ عەقلێ مروڤى لسەر ڤان هەر دوو بنەمايا هاتينە ئاڤاكرن و گەشەپێدان،هەر وەها تەڤ كارەساتێن هاتينە رويدان ب درێژاهى يا ديروكێ, ئەو گرفت و پرس گرێ و قەيرانێن مەزن ئەوێن هەڤرويشى جڤاكێن مروڤاتيێ بووين, د بنەڕەتدا پرسگرێكێن زمانى بووينە، چونكو ئەڤ لايەنە يان يێ دى نەشيايە برێكا گوتن و زمانى پەيامێ خوە بگەهينيت, يان ب گوتنەك دى بفەرهەنگەگ بەرتەسك و زمانەك لاواز نەشيايە

دەربرینیَ ژ پەیام و پروژە و بەرژەوەندییَن خوە بکەت و ئەویَ دی پیَ رازی و قایل بکەت ، د ئەنجامدا پەنا بریە بەر بکار ئینانا دەستان و هیَزیَ هەتا بکاریت پروژەکتیَ خوە بگەهینیت.

دبینین کو ئەم هەمی رۆژانە د هەڤپەیڤینیَن خوەدا نەچار دبین لڤینا دەستان بکار بینین, چونکە دبینین کو لڤینا دەستان هاریکاریا مە دکەت د پرۆسەسا دەربرینیَ دا ، و ب ڤیَ چەندیَ ژی ئەم ب ئاوایەکیَ نەئاگا دبیَژین کو ئەم نەشیَین ب ئاخفتنیَ پەیامیَ خوە ب گەهینین و ب زەلالی دەربرینیَ ژ ناخیَ خوە بکەین ، هەلبەت هەڤبەندیەك موکوم هەیە دنیَڤبەرا روحیَ و جەستەی دا ، د ناخیَ مروڤی دا ، د روحا وی دا ، هن ڤەشارتی هەنە ، کەس نەشیَت بگەهیتە ئاستیَ ڤەدیتنا ڤەشارتییَن هان و دەربرینیَ ژیَ بکەت ، لەوما ژ بوَ خویاکرنا وان ڤەشارتیا پەنای دبەنە بەر ب لڤاندن و بزافتنا ئەندامیَن جەستەی ، و ئەڤ چەندە ژی پتر بەرجەستە دبیت د سەما و ریتوالیَن سوّفیزمی دا، و ب دیدا وان هەروەها ب دیدا هندەك تیوّر و رەوتیَن هونەری نەمازە د واریَ شانوییَ دا, بزافتنا جەستەی و ب ریَکا هیَمایا دیَ کارین پتر ژ گوتنا, پەیامیَ خوە بگەهینین و لەوما ژی دیَ کارین بیَژین د پروّسەسا دەربرینیَ دا هەردەم هەڤرکیەك هەیە دنیَڤبەرا جەستەی و گوتنیَ دا ، و ئەڤ مژارە پتر ئالز دبیت دەما ب لڤینا دەستان ژی نەشیَین دەربرینیَ ژ حەز و خواست و تنگژینیَن (انفعالات) خوە بکەین ، ل وی دەمیدا, مروڤ ژ لڤینا دەستان بەر ب قوناغەك ترسناك تر دچیت, ئەو ژی بکارئینانا دەستانە ژ ئامرازەکیَ هاریکار ژبوی دەربرینی دا کو پتر دەربرینیَ ژ

هزرا خوه بکەت بۆ ئامرازەکێ هێندێ یان هزرە خو لسەر ئەوێ دی بچەسپینیت .

لسەر ڤێ مژارێ, من دگەل هەڤالێ خو یێ نڤیسکار و رۆژنامەڤان کاك غەیاس نەقشەبەندی گفتوگۆ کر ، وی گوت کو پرەنسیپەك فەلسەفی هەیە دبێژیت : (هزر دەما یا هێز و دەبەنگ تر بیت، دێ پتر پێدڤی ب توندی یێ هەبیت دا خوە بچەسپینیت ) ، یان کو دیاردا توندکاریێ سەرهەلدا دەما مروڤی هەولدا هزرێت خو بچەسپینیت لسەر دەوروبەرێ خوە و دەما نەشیای ب رێکا گوتن و ئاخفتنێ وێ چەندێ جهگیر بکەت ل وی دەمی هێزا دەستان بکار ئینا و ل دویڤدا بەر ب کارئینانا بەر و دار و شیر و خەنجەر و چەکێن دی ب هەمی جۆرێن خۆ یێن سڤك و گرانڤە چو و ب ڤێ چەندێ ژی پیشەسازی یا چەکی وەرار بخوڤە دیت ، چونکو دەما ب رێکا زمانی ئاریشە و گرفت چارەسەر نەبوون, ل وی دەمی ل جهێ زمانێ دایەلوگێ زمانێ چەکی دهێتە مەیدانێ ، دبینم کو شەڕ و جەنگ و هەڤرکیێن خوینەلۆ د بنەڕەتدا بۆ زمانی ڤەدگەڕێن, یانکو زمان ئەگەرێ سەرەکی بوویە ژبۆی سەرهەلدانا هەڤرکیێن هان, نەمازە هزرێن هێڕ و دەبەنگ, ئەو هزرێن پێدڤی ب هێزێ هەی ژ بۆی چەسپاندنا خوە و یێ بەرامبەر ژی نەچار دبیت یان ئەو ژی هەلگرێ رێژەکا دەبەنگیێ یە و ب هەمان شێواز سەرەدەریێ دگەل بکەت ، دیسان دبینم کو شەڕ و جەنگ و قەیرانا, کارتێکرنا خوەیا هەری وێرانکار هەیە لسەر پرۆسەسا پێشڤەچوونا زمانی دا ، و ئەڤ چەندە یا خویایە و نموونە لسەر د زۆرن, دەما هزرەکا دەبەنگ و پاشڤەڕۆ

هەول بدەت پروژەکتێ خو بچەسپینیت ، بۆ نموونە دەما رەوتەکێ سیاسی د خوازیت دانێن ئەڤی سەردەمی پاشگوه بکەت و پروژەکتێ خو یێ ل دەرڤەی دیروکێ بچەسپینیت, هەلبەت نەشێت ب رێکا زمانی و دایەلوگێ خەلکی پێ قایل و رازی بکەت, لەوما پەنای دبەتە بەر ب کارئینانا توندکاریێ .

هەلبەت د تەڤ بیاڤێن ژیانێ دا و لسەر ئاستێن جودا جودا لاوازیا زمانی و فەرهەنگێ رەنگڤەدانا خو هەیە و بووینە ئەگەرێن سەرەکی ژ بۆی دروستبوونا قەیرانا و سەرهەلدانا د یاردێن توندکاریێ و بەرپابوونا شەڕ و جەنگێن خوینەلۆ ، و دبینم ئەگەر مروڤ خودان فەرهەنگەکا ب هێز بیت دکاریت ب رێکا وێ و بزمانەکێ زەلال و ب گوتارەکا ڤەکری پەیامێ خوە ئاراستە بکەت و ئەوێ لهەمبەر ب دید و بۆچوونێن خوە قایل بکەت و پرێن دایەلوگێ موکوم نابن ئەگەر زمانەکێ ب هێز و فەرهەنگەکا خورت و زەنگین ل پشت نەبیت ،و ئەو جڤاکێن شیاین زمانێ خو ب هێز بکەن شیاینە کار ئینانا دەستان و هێزێ د هەڤپەیڤین و سەرەدەرییێن خوە دا کێم تر بکەن ،ولدویڤدا شیاینە خوە ژ کۆمەك قەیران و پرسگرێکێن جڤاکی وسیاسی و چاندی قورتال بکەن ،بەروڤاژیا جڤاکێن گرتی و پاشکەفتی وخودان فەرهەنگێن لاواز, کو هەردەم لوژیکا هێزێ ل جەم وان یا زالە و هەردەم هەڤرویشی گرفت و پرسگرێکێن رۆژانە دبن و پەیوەندی یێن وان هەمیشە یێن قەیرانکینە .

ئەگەر لسەر دیاردا لێدانا زاروکان د مال و خویندنگەهێ دا ب پەیڤین وبکەینە نموونە ،دێ بێژین هەر چەندە ئەڤە چەند سالە ل

کوردستانا ئازاد لێدانا خویندەڤانا هاتیە قەدەغە کرن, لێ د پڕانی یا خویندنگەهێن مەدا مامۆستاییێن مە نەشیاینە خوە ژ ڤێ دیاردێ قورتال بکەن ، دبینم هەتا ئەم بکارین ڤێ یاسایێ ب دروستی جێ بەجێ بکەین ، پێدڤی یە سازییێن پێگەهاندنا مامۆستایان پتر پویتەی ب زمانی بدەن و فەرهەنگا مامۆستایا زەنگین و بەرفرەھ بکەن, نەب تنێ هەتا پەیرەوێ خویندنێ بگەهینتە خویندەڤانا بەلکو هەتا بکاریت ب رێکا زمانی و دایەلوگێ پەیوەندیەك زەلال دگەل دەوروبەرێ خوە د خویندنگەهێ دا دروست بکەت, چونکو کارکرن لسەر زمانی و فەرهەنگێ و پیشەسازیا دروستکرنا رستەیێن نوی و سەرنجڕاکێش و گوهڕینا ناڤەروکێ گوتارا پڕ فەرمان و توندڕەو ،بەر ب گوتارەك ڤەکری و میانڕەو دێ ئاسوییێن جێ بە جێ کرنا یاسا قەدەغەکرنا لێدانا خویندەڤانا بەرفرەھ تر کەت ،و دێ ئەنجامێن خوە یێن ئەرێنی و پوزێتیڤ هەبیت لسەر پرۆسەسا پەروەردێ و ئاڤاکرنا مروڤەکێ ساخلەم ژ لایێ دەروونی ڤە ،ڤێ چەندێ ژی دێ باندۆرا خوە هەبیت لسەر تەڤایا تێکستا مە ژ لایێ جڤاکی و سیاسی و چاندی ڤە, و ل دویماهیکێ دێ کارین خوە ژ گەلەك پرسگرێکێن نەپێدڤی رزگار بکەین, دیسان دەما مروڤ خودان فەرهەنگەکا ب هێز و دەولەمەند بیت, رامانا وێ ئەوە کو مروڤ خودان پروژەکتەك هزری ب هێزە و ب ڤێ چەندێ ژی دێ کاریت پتر گوهدێریا ئەوێ دی بکەت ، کو گوهدێری ب خوە ژی ئێکە ژ مەرجێن سەرەکی د پرۆسەسا دایەلوگێ دا ، دایەلوگ ب رامانا دابینکرنا دەلیڤێ بۆ هەڤدوو کو هەر دوو لایەنێن جیاواز بکارن هزرو دیدو

بۆچوونێن خوه رابگەهینن، هەلبەته هەر یێك ژ وانا هەول ددەت کو پروژەکتیێ خوه بچەسپینیت و ئەویێ دی پێ قایل و رازی بکەت لێ دویر ژ توندوتیژی یێ ،ل ڤێریێ پیڤەرێن دی دهێنه قادیێ ل جهێ بکارئینانا هێزیێ و توندکارییێ و رەشڤەکرنا هەڤدوو ،زمان و فەرهەنگ و لوژیك رولەك هەری گرنگ دلەیزینن، و زمانیێ دەولەمەند د کاریت ب رێکێن دیموکراتی و ئاشتیانه پرسگرێیا چارەسەر بکەت.

# قەبران و عەقل و سیستەمێ هزرکرنێ

بەرهەمێ ئەدەبی مینا هەر بەرهەمەك دن ، ل سەر لوژیك و دید ونێرین و تێگەهەکی هاتیە ئاڤاکرن ، کو ئەو هەمی ژی ب تێکڕا بەرهەمێ گاڤەکا دیروکی یا دەستنیشانکرینە ، یان ب گوتنەك دن ، ئەدەب بەرهەمێ تۆڕەکا ئالز و تێکڕەسە ، هژمارەکا فاکتەران کارتێکرنا خوە دکەنە سەر ڤی بەرهەمی یان یێ دن ، ڤێجا ئەوا ئەدەب وەکو لڤینەکا هزری – ستاتیکی – زمانەڤانی داخبار نابیت ب وەرار و پێشکەفتنا زانستی و مەعریفی و تەکنەلوژی و هزری د جیهانێ دا ، ب رامانەك دن ئەڤ دەستکەفتێن تەکنولوژی و زانستی کو ئەڤرو پڕانی یا جڤاکێن مروڤینی دژیانا خوە یا روژانەدا ب کار دئینن و مفایەکێ ئێك جار زور ژێ وەردگرن ، ئەڤ دەستکەفتە ب ئاوایەکێ راستە راست و ئێکسەر کارتێکرنا خوە دکەنە سەر هشێ

تاكە كەسی و د كارین بێژین كو مروڤێن جڤاكێن ڤەدەر ب تێكڕا دقەیرانەكا ئالز دا دژین و پروسەسا هزركرنێ ل جەم وان یاتێتە سەروبنكرن و لەومازی دكارین بێژین كو ئەم نەشێین مفای ژ دەستكەفتێن تەكنولوژی وەربگرین و بێخینە دخزمەتا جڤاكێ خوەدا ، و ژلایەك دن خوە ڤەدەر بكەین ژ وی عەقلی ئەوێ شیای ڤان دەستكەفتا ب دەستڤە بینیت و ب تایبەت ئەنتلجنسیا جڤاكێن دائێخستی كو ئەڤ دەستكەفتە بووینە ئەگەرا دروستبوونا كومەك پرسیارا و دئەنجامدا هزرەك رەخنەیی دجڤاكێن هان دا سەرهلدایە ، ئیرو پەیوەندیێن مروڤێ روژئاڤا وەكو نموونە ب رێكا چەندین كەنال و پرانسیپێن موكم تێكهەل دبن و نڤیسكارێ كورد دكاریت ب هێسانی ل سەر بەرهەمێ هزرا جیهانێ هەلببیت و هایداری چەمك و تێگەه و دیدێن نوی ببیت ، و هەلبەت ئەڤ چەندە كارتێكرنا خوە دكەتە سەر بەرهەمێ وی یێ ئەدەبی و سەرەدەریكرنا وی دگەل فورم و ئامرازێن دەربڕینێ و بەلكو چەوانی یا هزركرنێ ل جەم وی ب تێكڕا بەرەڤ سەنتەكا دی بریە ، لەوما دبینین كو نها داهێنەرێ كورد ل سەر هژمارەك بن نەهاتی ژ پرسگرێ و گرفتێن جڤاكی و هزری رادوەستیت ،كو بەری یا نها مە هزر دكر جڤاكێ مە جڤاكەك ئارام و مەند و بێ قەیرانە ، ئیرو هەنە ب دیدەك رەخنەگرانە تەماشەی تێكستا خوە یا جڤاكی دكەن و روژ بو روژێ پێتر پرسیار دمێشكێ مەدا دروست دبن و دبینین كو ئەم بەرهەمێ هزرەكێینە ، بەرهەمێ كەلتورەكینە كو ئەو كەلتور نەشێت بەرسڤا پرسیارێن سەردەمی بدەتەڤە ، یان ئەو ب نەلڤی یا خوە ، فابریقە و سازی یا

دروستكرنا قەيرانايە ، لەوما داهێنەرێ كورد مينا داهێنەرێ هەر جڤاكەكێ دى يێ روژهەلاتى ، پەناى دبەتە بەر هژمارەك ژێدەرێن بيانى ، ژوانا فەلسەفە و تيور و ڤەخويندنێن روژئاڤا ، داكو ب كاريت ڤێ دياردێ يان يا دن شروڤە بكەت و ل سەر گرێ و ئالزيێن وێ راوەستيت ، و بڤى ئاوايى پروسەسا هزركرنێ ل جەم پتر هێزدار دبيت ، يان چەوا هەنە د زانستێن دى دا مفاى ژ زانست و تەكنەلوژيا روژئاڤا وەردگرن ، ب هەمان شێواز پێدڤى يە د زانستێن زمانەوانى و جڤاكى دا مفا ديسان ژ دەست كەفتێن مەعريفى ژى بهێن وەرگرتن و د ئەنجامێ كارتێكرنا وێ دێ ل سەر مە ، و پەيدابوونا دايەلوكەكا راستەوخوە و نەراستەوخوە دنێڤبەرا دوو پروژە و عەقلێن جياوازدا ، كو هەر ئێك بەرهەمێ گاڤەك جوودانە ، ( تێكست و هزر و كەلتور و عەقلێ روژهەلاتى بەرامبەر تێكست و كەلتور و عەقلێ روژئاڤا ) تێكهەليەك رێژەيى دروست بوويە و ئێدى مروڤ نەشێت چ پرسگرێ يا پاش گوه بێخيت ، لەوما دبينين كو گوتارا مە و ل سەر هەمى ئاستان ، چاندى ، هزرى ، سياسى ، ياسايى ... هتد ، د لڤينەك بەردەوامدايە و ل پەى خويندنا من دێ كارين بێژين كو نە بتنێ داهێنەرێ كورد ، بەلكو تاكە كەسێ كوردستانێ ب گشتى ، د هەولەك دوِمدار دايە كو هەمبێژا دانێن نوى بكەت و سەرەدەريەك ئەكتيڤ و عەقلانى دگەل دانێن هان بكەت ، ديسان و د ئەنجامێ ڤێ دايەلوكا رەخنەيى و ديروكى و مروڤينى و مەعريفى ، كومەك مژارێن دى ل جەم مە خويا و بەرچاڤ دبن و هەروەها كومەك دن ژ جياوازيا زق دبن و يا ئاشكرا دبيت كو جڤاكێ مەژى ، مينا هەر جڤاكەك دى

یێ پڕە ژ جیاوازی یا چ ل سەر ئاستێ سروشتی یان جیاوازیێن ئاگایی و داخوازەك رژد هەیە و پێدڤی یە ئەڤ جیاوازییە یان یا دن ب ئازادانە دەربڕینێ ژ پروژێ خوە بکەت ، ئەڤە ب تنێ ل سەر ئاستێ جڤاکی و سەندیکاییێن پیشەیی ، بەلکو تاکە کەس ژی یێ کار دکەت کو رزگار بیت ژ سانسور و دەستهەلاتێن جودا جودا و یێ کار دکەت کو ئازادیا خوە پراکتیزە بکەت ، و ل سەر ئاستێ ئەدەبی ژی ئەڤ مژارە پتر یا بەرچاڤ دبیت و دبینین کو ل کوردستانێ هژمارەك سەکو و ئەزموون و پلاتفورم دروست بووینە کو هەر ئێك ژوانا خوەدی پروژەك جیاوازە ل سەر ئاستێ مەعریفی و ستاتیکی ، و دبینین کو پوختەیەك نڤیسکار و ئەدیبێن کورد هەنە هەول ددەن ئامراز و تەکنیکا خوە نوی بکەنەڤە و ئەڤەژی ئەنجامەکێ سروشتی یێ وەرارا دیروکی و ڤێ دایەلوك و پێشکەفتن و تێکهەلیێ یە ، و ئەگەر ل دور ڤەیرانا ژی بپەیڤم وەها هزردکەم کو هەبوونا ڤەیرانا ڤەدگەرێت بو هەڤرکی یا دنێڤبەرا دوو جەمسەر و دیدێن جیاواز دا ، ڤەدگەرێت بو زالبوونا هزرا سەلەفی د جڤاکێ مەدا ، و ئێك ژ سیماییێن سەرەکی یێن ڤێ هزرێ ئەوە کو ناهێلیت نڤیسکار یان ئەدیب یان هەر مروڤەك دن ل دەرڤەی بازنا وێ هزر بکەت یان سەلەفیەت ب فورم و شێوازێن خوە یێن جودا جودا ( ئایینی ، ئایدیولوژی ) یا ل ژێر فشارا تێکستا و هزرێن بەرێ دژیت و ناهێلیت کو ئەدیب ل دویف نموونێ خوە یێ تایبەت بگەرێت ، چونکو ئەڤ رەوتێ سەلەفی وەها هزر دکەت کو یێن بەرێ ،دویماهیك دەستکەفت و پێزانین ب دەستڤەئینانینە و ئیدی هەر پروسەسەکا

زێدەگاڤی ( تجاوزی ) پروسەسەك نەڕەوا و ڤاڕێ یە ، چونکە دەستکەفت و تێکستێن بەرێ پیرۆزن و راستییێن رەهانە ئیدی نابیت بکەڤنە دبازنێ گومانێ دا ، هزرا سەلەفی قەیرانا دروست دکەت و ناهێلیت دایەلوك دگەل ئەوێ دی بهێتە کرن ، دیسان رێکێ نادەت کو هەڤبەندی و هەڤگەهشتن دنێڤبەرا جیاوازیادا هەبیت ، یان ب گوتنەك دن رەتکرنەڤا ئەوێ دی دروشمێ سەرەکی یێ ڤێ رەوتێ یە ، ئەو رەوتا ل دەرڤەی دیروکێ دژیت ، دخوازیت کو ئەم هەمی فوتوکوپییێن ئێك بین ، ب هەمان شێواز هزر بکەین و ل پەی ئێك رێبازا ئەدەبی یان هزری جووت بین و دوێ چارچیڤێ ئەوێ ژلایێ ئەوێن بەرێ ڤە هاتینە چێکرن چ جاران دەرنەکەڤین ، بو نموونە ئیرو گەلەك جاران قالا پرسگرێ یا وەرگری دهێتە کرن ، تێ گوتن کو وەرگر یێ دویرە ژ تێکستێن ئەدەبی ئەوێن پێلێن نویکارخوازیێ تێدا بەرەڤ بەرجەستەبوونێ دچن یان وەرگر یێ دویرە ژوان تێکستا ئەوێن ب فورم و شێوازێن نوی دهێن نڤیسین ، رەوتا سەلەفی دخوازیت بەردەوام تێکست یا راستەوخوە و راپورتی بیت و هێما و رستەیێن زەلال و کەهی بن داکو وەرگر بکاریت ب هێسانی ڤان تێکستا وەربگریت ، ل ڤێرێ قەیرانا مەزن ئەوە کو وان دڤێت وەرگر هەر و هەر بمینیت ل جهێ خوە یێ نێگێتیڤ ، وەرگر ل پەی دیدا ڤێ رەوتێ ، نوینەراتی یا جەماوەری دکەت ، یان ب گوتنەك دن نوینەراتی یا تەخێن خوارێ یێن جڤاکی دکەت و وەرگر یێ سادە و ساکارە و نڤیسکار یێ داخوازکری یە کو ل شوونا وان هزر بکەت و ئەرکێ نڤیسکاری یێ سەرەکی ئەوە کو وەرگری ئاراستە بکەت

بەرەڤ ئارمانجەکا دەستنیشانکری ، و وەرگری ماف نینە کو دایەلوکێ دگەل نڤیسکاری بکەت یان هەر د تێکستێ دا ( ئەوا راستەوخوە و راپورتی) ئەو ڤالاتی تێدا نینە ، کو بیاڤێ بو پروسەسا دایەلوك و هزرکرنێ دابین بکەت و بڤی ئاوایی وەرگر تێتە پوّلینکرن سەر دوو لایەنا ، یان دگەل نڤیسکاری دا بیت ، یان دژبەری وی بیت و ئەڤەژی دناخێ خوەدا ڤەدگەرێت بو کەلتوریّ زال, ئەو کەلتوریّ هاتی ئاڤاکرن ل سەر شەنگستێ هەبوونا هەڤرکیەك دوّمدار و دنێڤبەرا دووانیێن هەڤدژ و ئێك دوو ماندەل دکەن ، ئەگەر پتر ل سەر پرسگریّ یا وەرگری راوەستین ، دیّ بینین کو ئەڤ پرسگریّ یە ڤەگرێدایە ب پرسگرێیەك ئالز و بەرینتر ڤە ، ئەو ژی پروسەسا دروستکرنا بریاریّ یە ، د جڤاکێن دائێخستی و ڤەدەر دا بریار ل سەرڤە ، ژ لوتکا دەستهەلاتێ دهێتە دەرکەفتن و بەرەڤ خانێن خواریّ دچیت و ئەو خانێن دویر ژ سەنتەریّ دروستکرنا بریاریّ ب تنێ ئەرکێ جێبەجێکرنێ هەیە ، وی وەکو وەلاتی ماف نینە پشکدارییّ د پروسەسا دروستکرنا بریاریّ دا بکەت ، و ڤیّ چەندیّ رەنگڤەداناخوە ل سەر پروسەسا وەرگرتنا کارێن ئەدەبی هەبوویە ، ب گوتنەك دن نڤیسکار دبیتە پشکەك ژ توّرا دەستهەلاتێ لەوما پێدڤی یە ئەو هەول نەدەت پرسیارا د مێشکێ وەرگری دا دروست بکەت چونکو دروستبوونا پرسیاران ل سەر ئاستێ تێکستا ئەدەبی دیّ بیتە ئەگەرا دروستبوونا پرسیاران ل سەر ئاستێن دی و لەوما ژی ئێروّ پرسیار ل دور پەیوەندی یا نڤیسکار و رەوشەنبیرا ب دەستهەلاتێ ڤە بویە پرسیارەك ئاراندیو بەردەوام دان و ستاندن ل

دور دهێتە کرن ، و هەتا رادەیەکی ئەڤ پرسیارە ل پەی دیدا من پرسیارەك سادە و ساکارە یا فەر ئەوە ئەم پرسیارا ل دور پەیوەندی و دید و ڤەخویندنا نڤیسکار و رەوشەنبیری ب هزرا زال ڤە ب ئارینین ، قەیرانا مەزن ئەوە کو رەوتا سەلەفی کار دکەت کو وەلاتی هەر ل جهێ خوە یێ نێگێتیڤ بمینیت ، و وەرگر تێکستا رەت بکەتەڤە یان ژی هەمبێز بکەت بێی کو عەقلێ خوە وەکو تاکە کەس بکاربینیت ، بەلکو وان دڤێت تاکە کەس ژ کومێ هاڤی نەبیت و ژلایێ وان ڤە بهێتە هاژوتن ، و ژلایەك دن ڤە ئەدیب وەکو مروڤەکێ رەوشەنبیر روژانە پەیامێن نوی دگەهنێ و یێ هەول ددەت مفای ژ دەستکەفتێن زانستی و فەلسەفی و تیوری وەربگریت و ل پەی دیدێن نوی هەول ددەت ب ئەزمونەکا نوی راببیت و ئامراز و تەکنیکەك سەردەم د تێکستا خوە دا بکاربینیت ، وەکو مروڤەکێ دامێنەر هاڤی دبیت ژ تێکست و هزرێن زال ، هەلبەت ئەگەر ئەو بڤان زێدەگاڤی یا راببیت و وەرگر ل جهێ خوە یێ نێگێتیڤ بمینیت دێ بیتە سەدەما دروستبوونا قەیرانەکێ دهەمێ جڤاکان دا ئەنجامەکێ سروشتی یە و لەوما ژی ئیرۆ هەر ژانرەکێ ئەدەبی وەرگرێ خوەیێ تایبەت هەیە کو خوشی و چێژێ ژێ وەربگریت ، و وەها دبینم کو قەیران یا دنێڤبەرا دوو رەوتا دا ، رەوتەکێ پارێزەر و چاڤلێکەر و سەلەفی و رەوتەك دن کو یێ ب پروسەسا نویخازیێ رادبیت ، نە ب تنێ دنێڤ قادا ئەدەبی دا بەلکو ئەڤ هەڤرکی یە پتر یا بەرچاڤ و زقە دقادێن دی دا ، نەمازە ل سەر ئاستێ سیاسی کو ئەڤرو جیهان ب هەڤرا یا مژویلی هەڤرکیەك خوینەلۆیە دنێڤبەرا جەمسەرێ

دیموکراتخواز و ڤەکری و پلورالیزم و جەمسەریێ هەلگرێن هزرێن ئێك لایەن و توندرەو و توتالدا, کو هەرئێك ژوان هەلگریێ پەیام و پروژەك چاندی و بازێرڤانی یا جیاوازە و هەلبەت ڤێ هەڤرکی یا چاندی کارتێکرنا خوە هەیە ل سەر چاند و ئەدەب و هزرا کوردی و دقادا هان دا تا نهو هزرێن ئێك لایەن و توتال تا رادەیەکی ییێن زالن ، ل هەمبەر ژی رەوتەك نوکارخواز و ریفورم هەیە ، بو نموونە ئیرۆ چەندین بانگەواز هەنە کو پێدڤی خویندنێن رەخنەیی ل سەر پەیرەوێن خویندنێ ب هێنە کرن ، پێدڤی یە گەلەك بەندێن یاسایێ ب هێنە گوهرین ، قەیران قەیرانا ئازادیێ یە ، کو ژ لایەکی ڤە هزرێن زال رێکێن دەربرینێ و چەوانی یا هزرکرنێ ییێن چارچویف کرین و ژ لا یەك دن ڤە کەسێ نڤیسەر و داهێنەر پێدڤی ب ئازادیەکا رەها هەیە داکو ب کاریت ب دروستی دەربرینی ژ پروژێ خوە یێ تایبەت بکەت ، ئەم هەمی تشتی ب دیدەك سیاسی دخوینین ، هەتا تێکستا ئەدەبی ژی ل گۆری پیڤەرێن سیاسی تێتە راڤەکرن ، هەروەها پروسەسا خویندنێ یا زال پروسەسەك سەلەفی یە ب هەمی رامانێن خوە ، بەری یا ئەم دەست ب خویندنا تێکستا ئەدەبی بکەین ، مە حوکمێن پێش وەخت هەنە ، مە هەلویستەك بەرهەڤ هەیە ، بەروڤاژی خویندنا ڤەکری هەول ددەت تێکستێ ڤەخوینیت و ل دویڤ دا حوکمێ خوە دیار بکەت ، ئەڤە ئاریشەك مەزنە ، نە نڤیسکاریێ مە دکاریت ب ئازادی تێکستا خوە دارێژیت و نە وەرگر ژی بویە گەروکەکێ ئازاد دنێڤبەرا هزر و دید و فۆرمێن جودا جودا دا ، بەروڤاژی, یا فەر ئەوە کو وەرگر د خویندنا خوەدا ، بەرەڤ لوژیکا

تێکست ل سەر هاتیە ئاشاکرن بچیت ،وێ لوژیکێ ب هەلوەشینیت و بونیاتێ وێ یێ شەشارتی ئاشکرا بکەت ، ل وی دەمی نڤیسکار دێ هەستێ کەت کو ئەوێ بەرامبەری وی ( وەرگر ) یێ هوشیار و هوشمەندە ب دیدەك شەکری و رەخنەیی دێ تێکستا وی خوینیت ، ئەڤ پروسەسە دبیتە ئەگەرا پالدانا نڤیسکاری کو پتر بەردەوامیێ بدەتە پروسەسا نویکارخوازی و زێدەگاڤیێ ، لێ جارەك دن ڤەدگێرم و دبێژم مە قەیرانا وەرگری هەیە ، وەرگر ژی پشکەك کاریگەر و ئەکتیڤە دکار و بەرهەمێ ئەدەبی دا ، ئاریشا مەزن ئەوە کو مە وەرگر نینە ، دبیت گەلەك فاکتەر و سەدەم هەبن ، ژوانا ئەگەرێن ئابووری و مژویلبوونا کەسێ کورد ب ژیانا سەختا روژانەڤە و هەروەها هەبوون و بەربەلاڤبوونا ئامیرێن تەکنەلوژی، لێ هەبوونا رێژەکا زور نەخوێندەڤانا ئاستەنگەك سەخت و پڕ گرێ یە و ئەڤە هەمی بووینە سەدەم کو رەوشەنبیری ب گشتی و ئەدەب ب تایبەت بەهایێ خوەیێ جڤاکی نەبیت، د وەلاتەکی ژی دا ئەگەر بازارێ چاند و کتێبا یێ لاواز بیت ئەز باوەرم کو دێ ئاستێ داهێنان و ئافراندنێ ژی دێ یێ لاوازبیت ، و دیسان پروسەسا رەخنێ ل جەم مە پروسەسەك رژد و مەعریفی نینە و ئەگەر هندەك هەول ژی هەبن ، تانها نەگەهشتینە ئاستێ رەخنا ئەبستمولوژی ، کو دڤێ ئاستێ رەخنەگرتنێ دا بەرهەمێ ئەدەبی دهێتە پشکنین وەکو بەرهەمەکێ مەعریفی و کار ل سەر لایەنێ هونەری و هزری تێتە کرن ، یان ب گوتنەك دن کارێ رەخنەیی ل سەر وی عەقلی تێتە کرن ، ئەو عەقلێ ئەڤ بەرکارە یان یێ دن بەرهەم ئینایین ، وەلێ ل روژئاڤا رخنە

بەرەڤ ئاستێ ئێركولەژی چوویە ، بەرەڤ هەلوەشاندنا لوژیكا تێكستا لسەر هاتیە ئاڤاكرن ئەگەر ئەم ب كارین بێژین كو پروسەسا رەخنەگرتنێ دقادا ئەدەبێ كوردی دا ، یان ب گشتی دقادا چاندا كوردی دا یا سەرهلدای ب تنێ مەراڤەكرن و شروڤەكرنا ئایدیولوژی یا هەی كو بتنێ كار لسەر ئامرازێن هزری دهێتە كرن, لەوما ژی دبینین كو پروسەسا خوە دووبارەكرنێ یا هێزمەندە ب تنێ ل جەم گرووپێ رەهەندی یا پروسەسا رەخنەیا مودێرن یا بەرەڤ جهگیربوونێ دچیت و ئەڤ گرووپە ل سەر هژمارەك پرسگرێ یا رادوەستن و پرسیارێن نوی دئارینن كو بەری یا نها ئەڤ پرسیارە قەدەغەبوون ، د هەولەك دوٚمدار دانە ژ بوٚی هەلوەشاندنا تێكستا كوردی ب هەمی شێواز و فوٚرمێن خوەڤە ، و بەری یا هەمیان رەخنە ژ عەقلێ كوردی كو ل پەی باوەرا من ئەڤ گرووپە و هژمارەك كەسانێن دن یێن هەول ددەن كو بەرەڤ رەخنەیا ئاركولوژی ڤە بچن

ئەگەر پتر ل سەر قەیرانا ئەدەبێ كوردی ب پەیڤین دكارین بێژین سیستەمێ پەروەردەكرنێ و كەلەتورێ مەیێ ئایینی و جڤاكی و خێزانی ، كارتێكرنا خوە یا هەرە مەزن ل سەر تێكستێن مە یێن ئەدەبی هەیە, و دكارم دوو نموونا ل سەر ڤێ چەندێ بینم : ١- ئەگەر تەماشای پرانی یا تێكستێن مە یێن هەلبەستكی بكەین دێ بینین ، كو دهەلبەستا كوردی دا ئێك وێنەیێ سەنتەری یێ هەلبەستكی هەیە و ئەگەر هژمارەك وێنە و رستێن هەلبەستكی ژی هەبن ئەو هەمی ب هەڤرا ل دور وێ وێنەیێ سەنتەری دزڤرن, یان د

خزمەتا وی وێنەی دانە ، ئەڤەژی ڤەدگەرێت بۆ چەوانی یا هزرکرنێ ل جەم مە ، ئەم د جڤاکێن خوە دا وەها هاتینە پەروەردەکرن کو پێدڤی یە مە ئێك مەزن هەبیت ، و ئەم هەمی باوەری بێ ب ئێك هزر بینین و ئەو رێکا مە هەلبژارتی ، تنێ ئەو رێکا راستا سەرکەفتنێ یە ، لەوما ژی هەمی بزاڤ و چالاکیێن خوە دئێخینە د ئێك چارچویڤەدا و د ئێك بازن دا دزڤڕن, ئەڤە ڤەدزڤریت بۆ رەهایی و توتالیتاری یا هزرێ ل جەم مە ، دبینم تانهو ئەو دیدا زالە هەتا دنێڤ قادا ئەدەبی ژی ، ئەوێ تەماشای تێکستا ئەدەبی دکەت وەك ئامرازەکێ سیاسی, ئامرازەك ژبۆی هوشیارکرنا جڤاکی ، ب ڤێ دیدێ هەلسەنگاندنا ب کارێ ئەدەبی تێتە کرن ، بەروڤاژی پێدڤی یە تەماشای تێکستا کارێ ئەدەبی بهێتە کرن وەکو کارەکێ ئاڤاکەر .

پرسگەرێ یا مەیا مەزن ئەوە کو عەقلێ مە یێ داگیرکری یە و د عەقلێ داگیرکری‌ژی دروشم و وێنە و ئەفسانە و هێما ناهێنە لڤاندن و بەلگە ل سەر ڤێ چەندێ ئەوە ، کو رەوتێ بناڤ ئەدەبێ ریالزما سوشیالیست ب مەلیونەها خەلك خاپاندن و دەستهەلاتەك ب ئاگری و ئاسنی ئاڤاکرین ، و ل دویف دا ئەو ئەدەب خوە ب ئامرازەك ژ بۆ چەوساندنا جەماوەری ، سازیێن چاندی بوونە سازیێن سەرکوتکرنێ و رەشڤەکرنێ و ماندەلکرنا هەر فۆرم و میتۆدەك مودێرنزم و نویکارخواز ، د ئەنجامێ ڤێ رەهابوونێ دا ، جڤاك ب تێکڕایی ، بو جڤاکەك قەیراندار و نالەبار و دویر ژ هەر دەستپێشی و پێشهەلبوونەکێ, بەرەڤ دەستڤەئینانا دەستئێخستیێن زانستی و هزری و مەعریفی, بەرەڤ دروستکرنا جڤاکەکی کو ب کاریت

بەرەڤانییێ ژ پێڤاژویا وەرارا دیروکێ بکەت ، هەروەها رەهابوونا هزرکرنێ بو سەدەما هەلوەشیانا دەولەتا ل سەر ڤان بنەما و ستراکتورێن ئایدیولوژی هاتینە ئاڤاکرن .

٢- و ئەڤ هەلوەشیانە بو سەدەما هەلوەشیانا خویندنگەهێن ئەدەبی و هونەری ئەوێن رەواتی یا پروژێ خوە ژ ژێدەرا رەهابوونا ئایدیولوژی وەردگرن, لەوما بەری یا نها کارێن ئەدەبی ( رومان ، چیروك ، هەلبەست ، شانو ... ) سەرقالی رویدانێن مەزن و دروشم وشیرەتان بوون, کو سەرقالبوونا هان ئێکە ژ سیما و ساخلەتێن ئەدەبێ بناڤ ئەدەبێ بەرگرییێ ، کو ب باوەرا من ئەدەبەکێ هەڤبەندە ب ئاوایەکێ راستەوراست ب پروژەکێ سیاسی ڤە, و دڤێ قادا نڤیسینێ دا قوربانی ب لایەنێ هونەری دهێتە دان ، لێ ئەڤرو پشتی ڤان وەرچەرخانێن کاریگەر دبوارێ فەلسەفی و دەستکەفتێن تەکنەلوژی و هن سازیێن گەهاندنێ, ژانرێن دی یێن نڤیسینێ ڤەگەریانەك دروست بو ، ژ بوێ پێناسەکرنا هەر ژانرەکێ و مورکێ وی یێ هونەری و ستاتیکی, ئەڤجا نە بتنێ قوربانی پێ نەهێت دان ، بەلکو فەرە پتر ل سەر ڤێ لایەنێ بهێتە کرن بو پابەندبوون ب فورم و بنەماو ستراکتورێن بەرێ نەهێتە کرن ، ژ بەرکو دگاڤا پوست مودێرنیزمێ دا ، ئەدیب وەکو مروڤەك داهێنەر سنوورا دبەزینیت ، هەروەها باوەری ب پێناسەیێن گەهی و زال نینە ، بەلکو پێناسە دگوهرینەك دومدار دایە ، لەوما دڤێت پێناسە و نێرینا خوە یا تایبەت هەبیت ل گور هەر تێگەه و چەمکەکی و خویندنا خوە یا ئەمازەیی هەبیت بو هەر رویدان و بویەرەکی .

٣- ژ ئالیەك دن ڤە وەرگر د سەردەمێ زالبوونا ئایدیولوژیا و هزرێن توتال و دائێخستی دا ، هەردەم چاڤەرێی بەرسڤێن ئامادەکریە کو ژێرا بهێنە ئاراستەکرن ، و ب ئاوایەك ئەقلانی ڤان بەرسڤا هەمبێز دکەن و بێ کو پرسیارێن نوی دمێشکێ وی دا ب هێنە ئاراندن و کەلتورێ مە وەها ئەو پەروەردەکری یە کو مروڤەکێ فەرمان قایلدار بیت ، چونکە ژینگەهێ جڤاکێ مە هەیا نها یێ کەلتورێ تێکستسالاریێ ل سەر زالە ، وەرگر ژی بەرهەمێ ڤی کەلتورێ ئیفلیجە, پروسەسا هزرکرنێ و دەلیڤەیێن ئافراندنێ دکەت ، لەوما ئەڤ وەرگرێ نەرێنی ، هەردەم وان تێکستا ئەوێن ڤاڕێ بوون ژ هێلا زال تێدا هەین یان ئەو تێکستێن پرسیارا د هەشێ وی دا دروست دکەت ، رەنگ دکەتەڤە و پرس گرێ یان مەزن ژی ئەوە ، داخواز ژ ئەدیب نڤیسکار دهێت کرن کو گوتار و تێکستێن خوە ل پەی ئاستێ وەرگرێ نیگێتیڤ دارێژن ، وەلێ د سەردەمێ پوست مودێرنزمێ دا وەرگر بویە پرس گریەك ئالوز و جهێ دان و ستاندێ یە ، چونکە وەرگر وەك بەرجەستەکارێ بەرهەمێ ئەدەبی ، پشکەك زندی یە ژکارێ ناڤبری ، دڤێت سەرەدەریەك ئەکتیڤ دگەل ب هێت کرن و پێدڤی یە ئەم وەکو نڤیسکار هنگافتنێ بۆ هشێ وی دروست بکەین ، داکو بزانیت کو دانێن نوی ب هێسانی ناهێت هەمبێزکرن ، بەلکو پێدڤی ب ئاستەکێ هوشگەهێ بلند هەیە ، داکو ب کاریت ب سەر ڤێ لەهی یا پەیام دبویەر و هزر دکارێن ئەدەبی و هونەری راوەستیت و خویندنا خوە ژێرا بکەت ، کەلتورێ مەیێ زال بۆ نموونە وەها هەلبەست پێناسە کریە ، کو ئامرازەکە ژبۆی پروژەکێ

سیاسی و جڤاكی ، ئەو هەلبەستا هاتیە ناڤكرن ب هەلبەستا بەرگریكرنێ ، لێ دەما نها دێ بینیت كو هندەك هەلبەستڤان هەنە ، مینا هەلبەستڤان ئەنوەر مەسیفی ، سەرەدەریەك جیاواز دگەل رستا هەلبەستكی و هێما و زمانی دكەت و ژلایێ ناڤەروكی ڤە ، هەلبەستێن فەرمانسالاری رەت دكەتەڤە ، یان هەلبەستێ ب خوە ژ فشارا فەرمانسالاریێ رزگار دكەت ، هەڤرویشی قەیرانەك مەزن دبیت و ل پەی خویندنا, قەیران زور ئالز ترە ، كو بێژین ب تنێ یا د قادا هەلبەستێ دا هەی ، بەلكو ئیرۆ قەیران دناڤبەرا زمانێ گوندی و زمانێ بازێرپیدایە ، دناڤبەرا رستە و هێما زمان و كەلتورێ گوندی دهەمی فوۆرمێن فەرمانسالاری ڤە و هێما دكەلتور و زمانێ بازێرِی ب هەمی رەهەند و بنەمایێن كو داخوازا خوەسەری یا تاكە كەسی دكەن دەما ئەنوەر مەسیفی دبێژیت : ( من لۆ خوۆم كارەبام پێ لە ئەستێرە درەوشاوە ترە ، ئیجا لە دیتنی كیسەلەك وەردەگرم نەلە دیتنی دار سێوێك) یان دەما دبێژیت ( من لۆ خوۆم چێژ لە پەیكەرێك دەبینم نەك لە دارستانەك ) ئەڤە یاخیبوونەك ئەكتیڤە ، ژ بوّنا رزگاركرنا هەلبەستێ و مروڤی ژ سانسور و فەرمانسالاری و دووبارەكرنێ ، بەر ب ئازادیێ و بونیاتنانەك نویگەهـ بوّ پروسەسا وەرگرتن و داهێنان و ئافراندنێ ، و دەما نڤیسكار بەختیار عەلی ل سەر چار پرسیارێن فەلسەفی یێن بەربەلاڤ ( مروڤ چیە ؟ ئەو چیە ، ئەز دێ شێم بزانم ؟ و چ هیڤی ل پشت هەیە ؟ و چ ل سەر منە ئەز بكەم ؟ ) رادوەستیت, نە ب تنێ دنڤیسینێن خوە یێن هزری و رەخنەیی دا بەلكو د تێكستێن خوە یێن ئەدەبی ژی دا ئەڤ

دەرگەهێن نوی ڤەکرینە ، ئەڤ پرسیار و ڤەکرنێن هان ب دەمان پرسیارێن نوی دروست دکەن و هزرێن زال و چەوانی یا وەرگرتنێ د ئێخنە بازنێ گومانێ دا و هەلگرێن هزرێن یەقینی هەست دکەن کو ئەڤ ئاراندنا پرسیاران و دروستکرنا گومانێ مەترسی یە ل سەر دەستهەلاتداری یا هزرێن وان یێن نەلڤ ، ڤێجا دەما د هەر بیاڤەکێ دا ، شەپۆل و بزاڤتنەکا نویکارخواز و مودێرنیزم هەبیت دێ ل دژ راوەستن و هەول ددەن وی پروژەی ژناڤەروك و رامانێن وێ یێن ریفۆرمخواز ڤالا بکەن ، ل پەی باوەرا من ئەڤ رەوتێ سەلەفی شیا دوو گرووپێن نویکرنێ کو ل دەڤەرا بەهدینان پشتی سەرهلدانێ دروست بووین ( کۆما نویکرن هەر و هەر ل دهوکێ ، گرووپێ نویخواز ل ئاکرێ ) د سنوورەکێ بەرتەسکدا ئابلوقە بکەین و نەهێلین د قادا هەلبەستێدا دەرکەڤیت ، لەوما ژی دبینین کو ژمارەکا پرسگرێ یا هەنە ، قەدەغەیە ئاخفتن ل دۆر هەبن ، لێ ئەڤ هەولێن نویکرنێ تا رادەکی شیان لڤینەکێ دروست بکەن کو ب بیتە بنەما بۆ شەپۆل و بزاڤتنێن ئاییندە .

لێ ل دوماهیکێ دبێژم گەرەکە پتر بوێرانە و دیدەك عەقلانی و زانستی ل سەر ڤان مژارا راوەستین و ب ئازادانە و دویر ژ هەر سانسور و فشارەکێ راڤەکرنێن خوە ژێرا بکەین و بەردەوام دویێ باوەرێ دابین کو هەر پروژەکی رێژەکا راستی یێ تێدا هەیە و چ تێکست هەلگرێن راستی یێن رەها نینە ، لەوما پروسەسا دایەلوك و دانوستاندنێ هەر یا دۆمدار بیتن و بەردەوام پێداچوونێن رەخنەیی ل سەر هزرێن خوە بکەین ، و ئەوێ دی یێ جیاواز دگەل مە رەت

نەکەینەڤە و ب چ تومەتا گونەهبار نەکەین ، چونکە رەتکرنەڤا ئەوێ دی ئیفلیج کرنا پروسەسا دایەلوکێ قەیرانا دروست دکەت و ئەو قەیرانێن د قادا ئەدەبی دا هەین ناهێن ڤەدەرکرن ژ عەقلێ ئەڤ تێکستە یان یا دن بوویە بەرهەمێ وێ, فەرە کار ل سەر عەقلی ب هێتە کرن چونکە ئەڤ قەیرانە هەمی ب هەڤرا بەرهەمێ تۆرەکا مەزن و بەرفرەهە ، بەرهەمێ عەقلەکی یە کو د جڤاکێن روژهەلاتی دا عەقل بوویە سازی یێ دروستکرنا قەیرانا, و ئاخفتن ل سەر ئەدەب و تێکست و هزرا کوردی ، پتر و پتر هەلدگریت .

## اصدارات اتحاد الادباء الكرد/ دهوك
## ژ وەشانێن ئێکەتیا نڤیسەرێن کورد- تایێ دهۆکێ

١) نڤێژەك مەستانە ل دۆر گونبەدا جزیری/ ڤەکۆلین، د. فازل عومەر-٢٠٠٤

٢) خەونێن تازی/ هەلبەست، روخۆشێ زیڤار- ٢٠٠٤

٣) وەغەرەك د نهێنیین دەقی دا/ رەخنە وڤەکۆلین، یاسرێ حەسەنی- ٢٠٠٤

٤) بیاڤێ خواندنێ/ ڤەکۆلین، جەلال مستەفا-٢٠٠٤

٥) لبەر دەرازینکا تێکستان/ خواندنێن ویژەیی، سەلام بالایی-٢٠٠٤

٦) خواندنگەها برسیکرنێ/ چیرۆك، صدیق حامد-٢٠٠٤

٧) هزر ودیتن/ هزر و رەوشەنبیریا گشتی،د. عارف حیتو-٢٠٠٤

٨) چەند رێیەك بۆ دەقی/ ڤەکۆلین، صبیح محمد حسن-٢٠٠٤

٩) بەرپەرەکێ وندا ژ ژیاننناما سەلیمێ نەسمەرێ/ چیرۆك، انور محمد طاهر-٢٠٠٤

١٠) چەند خواندنەك شێوەکاری/ ڤەکۆلین، - ستار علی-٢٠٠٥

١١) ژانێن سیناهیێ/ رۆمان، تحسین ناڤشکی-٢٠٠٥

١٢) قصص من بلاد النرجس، حسن سلیڤانی(الطبعة الثانیة )-٢٠٠٥

١٣) گۆتارێن رەخنەیی/ کۆمەلە وتار، هۆشەنگ شێخ محمد-٢٠٠٥

١٤) گەریانەك د ناڤ باغێ ئەدەبێ کوردی دا، رەشید فندی-٢٠٠٥

١٥) سۆتنگەه/ رۆمان، بلند محمد-٢٠٠٥

١٦) سیا پۆشێ زێماری/ چیرۆك، د.فازل عمر-٢٠٠٥

١٧) شانۆیا هەڤچەرخ وچەند دیتن/ سیار تمر-٢٠٠٥

١٨) ڤیان د دەمەکێ ژاندار دا/ رۆمان، محسن عبدالرحمن- ٢٠٠٥

١٩) تەکنیکا ڤەگێرانێ د کورتە چیرۆکێن(فازل عومەری) دا/ ڤەکۆلین، نەفیسا ئیسماعیل-٢٠٠٥

١٥٣ ) توافا یاریٰ/ عەمەریٰ لەعلیٰ، هەلبەست، ٢٠٠٨

١٥٤ ) تیۆرا ویژەیی/ و: د. عارف حیتو، ڤەکۆلین، ٢٠٠٨.

١٥٥ ) الۆخەت د حەیرانۆکان دا/ جەمیل محمد شێلا زیٰ، ڤەکۆلین، ٢٠٠٨

١٥٦ ) شانۆ.../ سیار تەمەر، ڤەکۆلین، ٢٠٠٨

١٥٧ ) من نەڤێت ژ لەشیٰ تە ببارم/ بەیار زاویتەی، هۆزان، ڤەکۆلین، ٢٠٠٨

١٥٨ ) سهربەندیا بەردەوام زمانیٰ چامەیی/ فازل عومەر، ڤەکۆلین، ٢٠٠٨

١٥٩ ) ساکۆ/ نوزاد مزوری، کورتە چیرۆك، ٢٠٠٨

١٦٠ ) فەرهەنگۆکا کلاسیکێن کورد/ مەسعود خالد گولی، ٢٠٠٩

١٦١ ) ئەو پیاوەی بەلامەوە ڕت بوو/ بەهر موفتی، ٢٠٠٩

١٦٢ ) چەند بابەت و لێکۆلینێن زمانی/ عبدالوهاب خالد، ٢٠٠٩

١٦٣ ) سیمیاء الخطاب الشعری ٢٠٠٩

١٦٤ ) روژانێن ئەدەبیاتا کوردی-چیکی

١٦٥ ) ل بەرسفکا مە بەفر باریت/ محسن قوچان ٢٠٠٩

کردنەوەی دەرگای نهێنییەکانی شیعر، بەرەخنەگری وردبین و شوێنە هەڵگری زیرەک دەکرێت. دونیای شیعر و تێگەیشتنی ڕۆشنبیریەکی قووڵ و بەئەوی پێویستە، لە جای ئەوەی لێکۆڵینەوەی لەسەر بکەی..

کاک ئازاد کۆدەکانی قفلی واتای ئەم شیعرانە خەریک بووە و دەستی گەیشتۆتە هەندێک لە دوورگە شاراوەکانی دەق. ئەودیوی پەیامی شیعرەکانی شی کردۆتەوە وتێڕیناڵە شەن و کەوی کردووە.

سەرکەوت ڕەسول

تێکستا شیعری دەما ب زمانێ زەلال و فەرهەنگەکا هێزدار و بێی متداریەکا دەستکرد هاتبیتە نڤیسین، دەما هەر پەیڤەک ب هێماێن پڕ رامان هاتبنە بارکرن ، دەما هەلبەستڤان یێ سەرکەفتی بیت د پرۆسیسا هەلبژارتنا جەڤەنگ و رستەیان دا و دنێڤ بەرا پەیڤان دا بیاڤێن تەنگژینێ هەبن، د رستەیان دا لادان و ڤارێ بوون دروست ببن، ل وێ دەمی هەتا خوێندەڤانێ ئەکتیڤ ژی دێ تووشی هنگافتنا وەرگرتنێ بیت دێ ریتوالەکێ وەها ژ وەرگری را بەرجەستە کەت، وەرگر یان خویندەڤان دێبیتە گەرۆکەکێ ئازاد د گەردونێ تێکستێ دا و جێژەک مەزن ژێ وەربگریت و بو دەمەکێ درێژ دێ دگەل پەیڤ و رستە و بیرۆکە و وێنەو خوازە و کەسان و جهـ و پێکهاتێن دی دهوندری تێکستێ دا ژیت.

ئازاد دارتاش



ژ وەشانێن ئێکەتیا نڤیسەرێن کورد ـ تایێ دهۆکێ

تسلسل ١٦٦